# دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام!



نووسینی:
**محمد صالح المنجد**

وەرگێڕانی:
**جیهاد محمدسالح**



2020

تویێشووی موسڵمان 2




# ناسنامەی کتێب

زنجیرەی: **توێشووی موسڵمان**

ناوی کتێب: **دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام!**

نووسینی: **محمد صالح المنجد**

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: **جیهاد محمدساڵح**

پێداچوونەوەی: **مامۆستا هونەر سدیق**

دیزاینی ناوەوە و بەرگ: **جیهاد محمدساڵح**

ئیمەیل: jihad.m.salih@gmail.com







# پێشەکی

**(إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَمَّا بَعْدُ)[١].**

ئەوە بزانە کەوا خودای گەورە فەرمانی بە هەموو بەندەکانی کردووە، کە تەوبە بکەن.﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ٣١﴾[٢] واتە[٣]: ئەی ئیماندارەکان هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە تا ڕزگار و سەرکەوتووبن. بە هەمان شێوە خودای گەورە بەندەکانی کردووەتە دوو دەستە و تاقم، تەوبەکاران و ستەمکاران ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾[٤] واتە: جا ئەوەی پەشیمان نەبێتەوە ئەوە ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن.

---

١_ هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خودای گەورەیە، تەنها ستایشی ئەو دەکەین و داوای یارمەتی تەنها لە ئەو دەکەین، هەر کەسێك کە خودای گەورە ڕێنموویی کردبێت کەس نییە بتوانێت گومڕای بکات و هەر کەسێك کە خودای گەورە گومڕای بکات کەس نییە بتوانێت ڕێنموویی بکات، گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێت بە حەق و ڕاستی نییە لە (بەهاناوەچوون، شیفادەر، ڕوزیدەر، وەڵامدەرەوەی نزاکان، یاسادانەر، خۆشویستراوی ڕاستەقینە، دەستهەڵاتدا و فەرمانرەوا،.....) جگە لە "الله"، کە تاکو تەنیا و بێ هاوەڵە. گەواهی دەدەم کە موحەمەد نێردراو و پێغەمبەرە (ﷺ) . بەهۆی ئەم وشە جوانانەوە هاوەڵی پایەبەرز (ضماد آزدی) موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، کاتێك کەوا بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ گوێبیستیبوو لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) . (پوختەی سەحیحی موسلیم).

٢_ سورەتی النور.

٣_ تەفسیری ئایەتەکانم لە تەفسیری (پوختەی تەفسیری قورئان)ی بەرێز مامۆستا محەمەد مەلا ساڵح وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

٤_ سورەتی الحجرات.







ئێستا سەردەمێکە کە زۆرێك لە خەڵکان لە ئاینی ڕاستەقینەی خودای گەورە دوورکەوتونەتەوە و گوناه و نافەرمانیکردنی خودای گەورە بووە بە شتێکی ئاشکرا و دیار و تەنانەت وای لێهاتووە کەس نییە کەوا تێکەڵ بە گوناه نەبووبێت، مەگەر کەسێك خودای گەورە ڕەحمی پێ بکات و بیپارێزێت.

لەبەر ئەوە دەبینین چەندان خەڵك لە خەوی غەفلەت بێدار دەبنەوە و بەرەو رووی خودای گەورە و بەرنامەی ئیسلام دەگەڕێنەوە و دڵەکانیان بە نووری ئیمان و میهرو سۆزی خودای گەورە پڕدەکەن و لە تاریکاییەکانی گومڕایی بەرەو ڕووناکاییەکانی هیدایەت هەنگاو دەنێن.

بەڵام لەسەر ئەم ڕێگایە چەندین بەربەست دێنە پێشەوە کەوا کەسی گوناهکار گومان دەبات ئەم بەربەستانە بونەتە ڕێگر لەنێوان ئەو و تەوبەکردندا، کە هەندێکی لەنێو ناخی کەسەکەدایە و هەندێکیتر لە واقیعی ژیاندا خۆی مەڵاسداوە.

لەبەر ئەم هۆکارە ئەم پەیامەم نووسی، تاکو ببێتە ڕۆشنکەرەوە و هەڵاوێرکردنی گومانەکان و روونکردنەوەی فەرمانەکانی خودای گەورە و لادانی ختورەکان(وەسوەسە)ی شەیتان.

سەرەتای ئەم پەیامە باس لە مەترسییەکانی گاڵتەکردن بە گوناه دەکات، پاشان باس لە مەرجەکانی تەوبەکردنی ڕاستەقینە دەکات، پاشان باس لە چارەسەرە دەروونییەکان دەکات، پاشان خستنەرووی فەتوای تایبەت بە کەسی تەوبەکار کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودە سەحیحەکان و وتەی زانایان وەرگیراون.

داواکارم لە خودای گەورە کە یارمەتیدەرمان بێت و ئەم وشانە ببێتە مایەی سوود بو من و تێکڕای موسڵمانان و لە نزاکانی چاکەکاران بێ بار نەبم، خودای گەورە پشت و پەنای هەمووومان بێت.

محمد صالح المنجد






## پێشەکییەك لەسەر گاڵتەکردن بە گوناهەکان و بەکەم سەیرکردنیان

خودای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کردووە و واجبی کردووە کە تەوبە بە دڵســـــۆزی و ئیخلاســـــی بکەن. خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةً نَّصُــوحًا...﴾[1] واتە:ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاریی. هەروەها ڕێگەی بە ئێمە داوە تا تەوبە بکەین پێش ئەوەی(کرام الکاتبین) فریشتەکانی سەر شانمان کردەوەکانمان تۆمار بکەن. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (**إِنَّ صَاحِبَ الشِّمَالِ لِيَرْفَعُ الْقَلَمَ سِتَّ سَاعَاتٍ عَنِ الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ الْمُخْطِئِ، فَإِنْ نَدِمَ وَاسْتَغْفَرَ اللهَ مِنْهَا أَلْقَاهَا، وَإِلَّا كُتِبَتْ وَاحِدَةً**). واتە: فریشـــتەی لای چەپی مرۆڤ گوناهی بەندەیەکی موســـڵمان نانووســـێت تاکو شـــەش ســـەعات[2]، ئەگەر تەوبەی کرد و پەشـــــیمانبوویەوە لەو گوناهە و داوای لێخۆشـــــبوونی لە خودای گەورە کرد، ئەوا نانووسرێت، ئەگەر واشی نەکرد تەنها یەك گوناهی بۆ دەنووسرێت.

گوناهبارەکە مۆڵەتی تەوبەکردنی هەیە لەو گوناهە، تاکوو پێش سەرەمەرگ، بەڵام بەڵایەکە لێرەدایە کە زۆربەی خەڵکانی ئیمرۆ ناترسن لە شکۆ و گەورەیی خوای گەورە، بە شەو و بە ڕۆژ گوناه و سەرپێچی خودای گەورە دەکەن، دەستەیەکیان گیرۆدەبوون بە کردنی گوناهە بچووکەکان، دەبینی هەندێکیان زۆر بە کەمی سەیری گوناه دەکات و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: جا نەزەرکردن چییە، جا قەیدی چییە تەوقە لەگەڵ نامەحرەم بکەم، خۆ وەك مەحرەمەکان وان. جا سەیری ئافرەتان دەکەن لە گۆڤارەکان و لە فلیمەکاندا، گەر پێشی بڵێی ئەمە گوناهە مەکە، دەپرسێت: ئایا تاوانەکە لە گوناهە گەورەکانە یان بچووکوکان؟

---

١ــ ئەلبانی سەحیحی کردووە.

٢ــ جیاوازە لەگەڵ شەش سەعاتی ئەم سەردەمە(وەرگێڕ).







ئەگەر گەیشتە ئەم ڕاددەیە بەراوردی حالی ئەو کەسە بکە لەگەڵ ئەم دوو ئەسەرە[1] کە ئیمامی بوخاری گێڕاویەتەوە و دەفەرموێت:

_ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرمووێت:(**إنكم لتعملون أعمالا هي أدق في أعينكم من الشعر كنا نعدها على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم من الموبقات**) واتە: ئێوە هەندێك کردەوە ئەنجام دەدەن کە بە بۆچوونی ئێوە زۆر سووکترە لە موو، بەڵام ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بە گوناهە لەناوبەرەکانمان هەژمار دەکرد.

_لە ئیبنو مەسعودەوە گێردراوەتەوە کە فەرموویەتی: (**إن المؤُمنَ يَرى ذَنبَهُ كأنَّهُ في أصل جَبَل يَخافُ أن يَقَعَ عَليه وإنّ الفاجرَ يَرى ذُنوبَهُ كَذُباب وَقَعَ عَلى أنفه فقال لَهُ هكذا**) واتە: موسڵمان وا سەیری گوناهەکەی دەکات وەك ئەوەی لەژێر چیایەك بێت و بترسێت ئەو چیایە بەسەریدا بڕوخێت، کەسی خراپەکاریش وا سەیری گوناهەکەی دەکات وەك ئەوەی مێشێك بەسەر لوتی بنیشێت و ئاوای لێ بکات-واتە بە دەستەکانی- پاشان مێشوولەکە بڕوات.

ئایا ئەو کەسانە ناترسن کە گاڵتە بە گوناه دەکەن کاتێك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) دەخوێننەوە: ( **إيّاكم ومُحقّرات الذّنوب، فإنَّما مَثَلُ مُحقّرات الذُّنوب كمثل قومٍ نزلوا بطن وادٍ، فجاء ذا بعودٍ وذا بعودٍ، حتى جمعوا ما أنضجوا به خُبزهم، وإنّ مُحقّرات الذّنوب متى يُؤخذ بها صاحبها تُهلكه**) واتە: دەخیلتانبم خۆتان لە گوناهە سووتێنەرەکان بپارێزن، نموونەی گوناهە بچووکەکان، وەکوو چیرۆکی کۆمەڵە کەسێکە کە لە بیاباندا گیرسابنەوە، کەم کەمە پارچەی بچووکی چیلکەدار کۆدەکەنەوە، تاکوو بتوانن ئەو نانەی پێیانە بەو چیلکە دارانە دروستبکەن، ئەوە بزانن هەرکاتێك گوناهە بچووکەکان هەژمارکران ئەوکات خاوەنەکەی بەرەو لەناوچوون دەبات.

---

[1]_ (الأثر) واتە: ئەو وتانەی دەخرێنە پاڵ سەحابە و شوێنکەوتووان.(وەرگێڕ)







لە گێڕانەوەیەکی تر:(**إياكم و محقرات الذنوب، فإنهن يجتمعن على الرجل حتى يهلكنه**) واتە: دەخیلتانبم خۆتان لە گوناهە بچووکەکان بپارێزن، ئەو گوناهانە لەسەر کەسێك خردەبێتەوە و زۆر دەبێت، تاکوو لەناوی دەبات.

زانایان دەفەرموون: گوناهی بچووك بێشەرمی و گرنگی پێنەدان و نەترسان لە خوای گەورە و بەکەم سەیرکردنی تاوانی پێوە پەیوەستە، هەر ئەوەشە گوناهی بچووك دەکاتە گوناهی گەورە، هەر بۆیە هیچ گوناهێکی بچووك بە بچووکی نامێنێتەوە ئەگەر لەسەری بەردەوام بێت[1]، هیچ گوناهێکی گەورەش بە گەورەی نامێنێتەوە ئەگەر داوای لێخۆشبوون لێی لە خودای گەورە بکات.

هەربۆیە بەو کەسە دەڵێم:

**سەیری بچووکی گوناهەکە مەکە، بەڵکوو بزانە لەبەرامبەر کێ ئەو گوناهە دەکەیت.**

پشتیوان بە خودای گەورە ئەم وتانە سوودی دەبێت بۆ ڕاستگۆیان، ئەوانەی تۆشی گوناه کردن بوون، بەڵام لەسەری بەردەوام نەبوون و زانیویانە کە ڕێگەکەیان هەڵەیە و گەڕاونەتەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.

ئەم وتانە بۆ ئەو کەسەیە کە باوەری بە قسەی خودای گەورە هەیە کاتێك دەفەرموێت: ﴿نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٤٩﴾[2] واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە بەڕاستی هەر من لێبوردەی میهرەبانم. هەر وەك چۆن باوەرت بەو ئایەتە هەیە کە دەڵێت: ﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ۝٥٠﴾[3] واتە: وە بێگومان هەر سزای منە سزای سەخت.

---

١_ واتە: بە بەردەوام دووبارەکردنەوەی گوناهی بچووك ئەو گوناهە دەبێتە گوناهێکی گەورە. (وەرگێڕ)

٢_ سورەتی الحجر.

٣_سورەتی الحجر.







# مەرجەکانی تەوبەی ڕاستەقینە

وشـــەی تەوبە وشـــەیەکی زۆر گەورەیە، پێویســـتی بە تێڕامـــان و لێوردبـــوونەوەی زۆر هەیە، نەك وەك هەنـــدێك کەس تێـــی گەیشـــتوون کە وشـــەیەکە بە دەم دەڵێـــت و بەردەوام دەبێت لەسەر گوناهەکە.

ڕابمێنە لەم وتەیەی خودای گەورە: ﴿وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾[1] واتە: هەروەها بۆ ئەوەی داوای لێبوردن بکەن لە پەروەردگارتان پاشان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای.

لەبەر ئەوەی کارەکە گرنگە بۆیە دەبێت هەندێك مەرجی هەبێت، زانایان چەند مەرجێکیان داناوە بۆ تەوبەی ڕاستەقینە، **لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:**

**یەکەم:** دەست بەجێ واز لە گوناهەکە بهێنێت.

**دووەم:** پەشیمانبێت لەو گوناهانەی کە کردوویەتی لە ڕابردوودا.

**سێیەم:** سووربێت لەسەر ئەوەی بەهیچ شێوەیەك نەگەڕێتەوە سەر گوناهەکە.

**چوارەم:** گەڕاندنەوەی مافی ئەو کەسانەی کەوا ڕۆژێك لە ڕۆژان خراپەیەکی لەبەرامبەر کردووە، یاخوود داوای گەردن ئازاییان لێ بکات.

---

١_ هود: ٣







هەروەها  هەندێك لە زانایان چەند مەرجێکی تریيان داناوە بۆ (تەوبەی یەکجارەکی)، لێرەدا ڕوونی دەکەینەوە لەگەڵ هێنانەوەی نموونە لەسەریان:

**یەکەم: تەوبەکردنەکە تەنها لەبەر خودای گەورە بێت و لەبەر هیچ شتێکی تر نەبێت:**

نەك تەوبەکردنەکە لەبەر ئەوەبێت کە ناتوانێت بگەڕێتەوە سەر گوناهەکە، یان وەك پێشتر بۆی ڕێك ناکەوێت، یاخوود ، بۆیە گوناهەکە نەکات لە ترسی قسە و قسەڵۆکی خەڵك. بە کەسێك ناوترێت تەوبەکار کە واز لە گوناهەکە بهێنێت تا پێگەی لەناو کومەڵگە و خەڵکدا لەکەدار نەبێت، یاخوود واز لە گوناهەکە بهێنێت، تاکوو دەری نەکەن لەو شوێنەی کە کاردەکات. بە هەمان شێوە ئەوانەی کە واز لە گوناه دەهێنن، تاوەکو بە تەندرووست بمێننەوە، وەك کەسێك واز لە زینا و داوێنپیسی دەهێنێت لەترسی ئەوەی نەوەك تووشی نەخۆشییەکی کوشندە ببێت، یاخوود لەبەر ئەوەی لاشە و یادگەی لاواز دەکەن. بە هەمان شێوە ئەو کەسەی کە وازی لە بەرتیل وەرگرتن هێناوە لە ترسی ئەوەی کەسەکە بەرتیلی پێدەدات ئەندامی دەستەی لەناوبردن و نەهێشتنی بەرتیل وەرگرتن بێت و ئاشکرا بێت و دەزگیر بکرێت و بە کەسێك ناوترێت تەوبەکار وازی لە ئارەق و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان هێناوە لەبەر ئەوەی پارەی نییە و مایەپوچ بوە. بە هەمان شێوە ئەو کەسەی هیچ دەسەڵاتی نییە لە کردنی گوناهێك، چونکە لە هێز و دەستهەڵاتی ئەو بەدەرە، وەکو کەسێکی درۆزن واز لە درۆکردن بهێنێت، چونکە تۆشی زمانلاڵی بووە و قسەی پێناکرێت. یاخوود زیناکارێك کە نەتوانێت دووبارە زینا بکاتەوە، یان دزێك دەستەکانی لەدەست دابێت و نەتوانێت بگەڕێتەوە سەر دزییەکە، بۆیە لەسەر ئەو جۆرە کەسانە پێویستە کەوا پەشیمان ببنەوە لە کردنی ئەو گوناهانە  و سوربن لەسەر ئەوەی نەگەرێنەوە سەر ئەو گوناهانە بە هیچ شێوەیەك تەنها لەبەر خودای گەورە، هەروەك





پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:(**الندم توبة**) واتە: **پەشیمانبوونەوە تەوبەیە.** بزانە کەوا ئەو کەسەی هیوایەتی ئەوەیە گوناھ بکات، بەڵام توانای ئەو کارەی نییە، خودای گەورە ئەو کارە بە گوناھ لەسەر ملی دەنووسێت هەر وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (**إنما الدنيا لأربعة نفر: عبد رزقه الله مالاً وعلمًا فهو يتقي فيه ربه ويصِلُ فيه رحمه ويعلم لله فيه حقًّا، فهذا بأفضل المنازل، وعبد رزقه الله علمًا ولم يرزقه مالاً فهو صادق النية يقول لو أن لي مالاً لعملت بعمل فلان، فهو بنيته، فأجرهما سواء، وعبد رزقه الله مالاً ولم يرزقه علمًا فهو يخبِط في ماله بغير علم لا يتقي فيه ربه ولا يصل فيه رحمه ولا يعلم لله فيه حقا، فهذا بأخبث المنازل، وعبد لم يرزقه الله مالاً ولا علمًا فهو يقول لو أن لي مالاً لعملت فيه بعمل فلان، فهو بنيته، فوزرهما سواء**) واتە: دونیا بۆ چوار کەسە: بەندەیەك خودای گەورە پارە و سامانێکی زۆری پێداوە، ئەویش دەترسێت لە خودای گەورە و خۆی بەدوور دەگرێت لە حەرام خواردن و سیلەی رەحم بەجێ دەگەیەنێت (مافی نزیکەکانی دەدات لەو سەروەتە) و دەزانێت کە خودای گەورە مافی هەیە بەسەریەوە، ئەم کەسە لە باشترینی مەنزیلەتەکانە لای خودای گەورە و کەسێك خودای گەورە زانستێکی پێداوە و مال و سامانی پێ نەداوە، بەڵام ئەو کەسە لە خودای گەورە ناترسێت و بە سەروەتەی کە خودا پێی داوە سیلەی ڕەحم بەجێ ناگەیەنێت و مافیان نادات، نازانێت کە خودای گەورە مافی هەیە بەسەریەوە، ئەو کەسە لای خودای گەورە لە نزمترین و پیسترین مەنزیلەتەکانە و کەسێك خودای گەورە هیچ پارە و سامان و هیچ زانستی پێ نەداوە، دەڵێت: ئەگەر پارەم هەبوایە وەك ئەو کەسەم دەکرد، خودای گەورەش کردەوەکە بەو نییەتە بۆ دەنووسێت، لەو نییەتەیاندا وەك یەکن.







**دووەم: هەست بە قێزەونی و زیانی ئەو گوناهە بکات:**

ئەمەش مانـــای ئەوەیە ئەو کەســـەی کە تەوبەی ڕاســـتەقینە دەکـــات نابێـــت هەســـت بە کەیفخۆشـــی و ئاســـوودەیی بکـــات کاتێـــک بیـــر لەو گونـــاهە دەکـــاتەوە، یـــاخوود خۆزگە بخوازێت لە ئایندەدا جارێکیتر بگەڕێتەوە سەر ئەو گوناهە.

**ئیبولقەییم لە هەردوو کتێبەکانیدا: (الداء و الدواء) و (الفوائد) باسی لە چەندین زەرەرو زیانەکانی گوناهکردنی کردووە لەوانە:**

- بێبەشبوون لە عیلم و زانست.
- هەستکردن بە غوربەت و تەنیایی.
- سەختی کارەکان بەلایەوە.
- لاوازبوونی جەستە.
- نەمانی بەرەکەت.
- تەوفیقی خودای گەورە کەم دەبێتەوە.
- دەبێتە هۆی کردنی گوناه و تاوان.
- ڕاهاتن بە گوناه.
- بەچاوێکی کەم سەیرکردنی لە لایەن خودای گەورەوە.
- بەچاوێکی کەم سەیرکردنی لە لایەن خەڵکەوە.







- نەفرین و لەعنەتکردنی لەلایەن گیاندارانەوە.

- لەبەرکردنی جلی شەرمەزاری و دڵتەنگبوون.

- قوفلبوونی دڵی بە گوناهەوە و بەر نەفرین کەوتن.

- بێبەشبوون لە وەڵامدانەوەی نزاکان لە لایەن خودای گەورەوە.

- بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لە وشکانی و دەریاکانەوە.

- نەمانی غیرەت.

- نەمانی شەرم و حەیا.

- لەناوچوونی نیعمەت و بەخششەکانی خودای گەورە بۆ ئەو کەسە.

- دابەزینی بەڵاو نەهامەتی و خەم و پەژارە.

- درووستبوونی ترس لە دڵی گوناهباردا.

- کەوتنە ناو داوی شەیتان.

- عاقیبەت شەری(سوء الخاتمة).

- تووشبون بە سزای ڕۆژی دوایی.

زانینی ئەم زەرەر و زیانانە دەبنە هۆی ئەوەی بە یەکجاری واز لە گوناه بهێنیت.





## هەندێك لە خەڵكان واز لە گوناهێك دێنن و گوناهێكی تر دەكەن لەبەر ئەم هۆكارانەی خوارەوە:

١- پێی وایە كێشی ئەو گوناهە بچووكترە.

٢- لەبەر ئەوەی دەروون زۆر حەز بەو گوناهە دەكات، ئارەزوو بەهێزترە بۆ كردنی ئەو گوناهە.

٣- بارودۆخی ئەو گوناهە فەراهەمترە و هۆكارەكانی بەردەستن لە ئەوانی تر. بە پێچەوانەی ئەو گوناهەی كە پێوستی بە پلان و خۆ ئامادەكردن هەیە.

٤- لەبەر ئەوەی نزیكەكانی و هاوڕێیەكانی ئەم گوناهە دەكەن ئەویش ناتوانێت دەستبەرداراریان بێت و وازیان لێ بهێنێت.

٥- لەوانەیە ئەو كەسە بەهۆی ئەو گوناهەوە پێگەیەكی بەرزی هەبێت لای هاوڕێكانی، بۆیە پێی ناخۆشبێت ئەو پێگەیەی كە هەیەتی لەدەستی بدات، بۆیە بەردەوام دەبێت لە گوناه كردن، وەك: سەیركردەی گروپە چەتە و شەرانگێزەكان، هەروەكوو بۆ (ئەبو نەواس) شاعیری گوناهكار هاتە پێش كاتێك (ئەبو عتاهیە) ئامۆژگاری كرد بە وازهێنان لە گوناهكردن، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

أتراني يا عتاهي أتراني مفسدا بالنسك!

تاركا تلك الملاهي عند القوم جاهي

واتە:

ئەی عەتاهی ئایا پێت وایە من واز لە گوناهكردن بهێنم!

ئەی نازانی بەهۆی ئەو گوناهكردنەوە من پێگەم دەبێت لەنێو خەڵكاندا







**سێیەم:** تەوبەکار پەلە بکات لە تەوبەکردن و دوای نەخات، چونکە دواخستنی تەوبە بۆ کاتێکی تر خۆی لە خۆیدا گوناهێکی ترە کە پێویستی بە تەوبە هەیە.

**چوارەم:** بترسێت لەوەی کە خودای گەورە ئەو تەوبەیەی لێ وەرنەگرتبێت.

نەوەك بێباك بێت لەو تەوبەیە و ئەمین بێت لە (مەکری) خودای گەورە.

**پێنجەم:** بە ئەنجامگەیاندنی ئەو پەرستشانەی کە لە دەستی داون، ئەگەر توانای گێڕانەوەیانی هەبێت، وەکوو دەرکردنی ڕێژەی ئەو زەکاتەی کە لە ڕابردوودا لەسەری بووە، یاخوود ئەو مافەی کە هەژارەکان لەسەریتی پێیان بدات.

**شەشەم:** واز لە شوێن و هۆکارەکانی گوناهکردن بهێنێت، ئەگەر بزانێت دووبارە تووشی گوناهکردن دەبێتەوە.

**حەوتەم:** واز لەو کەسانە بهێنێت کە هانی دەدەن لەسەر گوناهکردن، (سوودی ئەم خاڵە و خاڵی پێشتر لە باسی فەرموودەی ئەو کەسەی سەد کەسی کۆشتبوو باسی دەکەین _ إن شاء الله).

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ٦٧﴾[١] واتە: دۆست و خۆشەویستەکان لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن، جگە لە پارێزکاران. هاوڕێ خراپکارەکان نەفرین لە یەکتری دەکەن لە ڕۆژی دواییدا، ئەی ئەو کەسەی کە تەوبەت کردووە لەسەرت پێویستە کە دووربکەویتەوە لە هاوڕێیەتی کردنی ئەو کەسانە و ئەگەر داواییان لێت کرد کە لەگەڵیان بگەڕێیت، نەکەی بە گوێییان بکەیت و شەیتان فێڵت لێ نەکات، خۆشت دەزانی کە چەندە زەعیف و بێ دەسەڵاتی و توانای خۆڕاگریت نییە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە خۆت بپارێزە لێیان.

---

١_سورەتی الزخرف.







چەندین حاڵەتی وا هەبووە کە چەندان کەس دوای تەوبەکردن گەڕاونەتەوە سەر هەمان گوناه و تاوان بەهۆی تێکەڵبوون لەگەڵ هاوڕێ خراپەکانی و نزیکەکانی.

**هەشـــــتەم:** لەنــاوبردنی هەموو ئەو شـــتە حەرامکراوانەی کە لەلای مــاون، وەکو: سەرخۆشکەرەکان و ماددە بێهۆشکەرەکانی وەکو(هیرۆین، تریاك، جگەرە، حەشیش...) و هۆکارەکانی گاڵتە و ڕابواردن وەك ئامێرەکانی مۆســیقا (عود، گیتار،....)، یاخوود وێنە و فلیمە حەرامکراوەکان، لەگەڵ چیرۆکە عاشقینیەکان و پەیکەرەکان و لەسەری پێویستە کە هەموو ئەو هۆکارانە بشکێنێت یاخوود بیسوتێنێت و لەناویان ببات.

لێرەدا بابەتێکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کە کەسی تەوبەکار دەبێت خۆی لە هەموو ئەو جل و بەرگانە بەدوور بگرێت کە ناشەرعین و جلی تەسك و تەنگ و بێ ئابڕون، چەندین بەسەرهاتمان گوێ لێبووە کە کەسی تەوبەکار گەراوەتەوە سەر گوناهکردن لەبەر ئەو جل و بەرگەی کە لەبەری بووە و نەیتوانیوە وازی لێ بهێنێت، کە بەهۆیانەوە لە سەر ڕێگەی هیدایەت لایان داوە و تووشی گومرایی بوونە، داوا لە خودای گەورە دەکەین کە (ئیستیقامەمان) پێ بدات لەسەر ئەم دینە پاکە.

**نۆیەم:** هاوڕێی چاك هەڵبژێرێت کە یارمەتی بدەن لەسەر کردەوەی باش و تێکەڵییان لەگەڵ بکات لە جیاتی هاوڕێی خراپ، دەبێت جەخت لەوە بکاتەوە کە لە گەڵیان بەشداری کۆڕی زیکر و یادی خودای گەورە بکاتەوە و وانە ئاینییەکان پێکەوە بخوێننەوە و کاتەکانیان بە شتی بەسوود پڕبکەنەوە، تاکوو شەیتان نەتوانێت زەفەری پێ ببات و بیگەڕێنێتەوە سەر گوناهکردن.







**دەیەم:** لاشـــەی ڕابهێنێت لەســـەر ئەنجامدانی کردەوەی چاك، هەروەك چۆن پێشـــتر لە گوناهکردندا بەکاری خســـتبوو، هەوڵبدات ئەو هێز و وزەیەی کە هەیەتی لە حەڵاڵدا بەکاری بهێنێت، تاکوو شەیتان هانی نەدات کە لە حەرام بەکاری بهێنێت.

**یانزدەیەم:** دەبێت تەوبەکردنەکە پێش سەرەمەگ بێت و پێش هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە بێت، (غەرغەرەش) بریتییە لە: دەرچوونی دەنگێك لە قورگدا کاتێك فریشتەی گیانکێشان گیانی ئەو کەسە دەکێشێت، مەبەست لێ ئەوەیە کە تەوبەکردنەکە پێش بەرپابوونی قیامەتی بچووك و قیامەتی گەورە بێت، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **(من تاب إلى الله قبل أن يغرر قبل الله منه)**[1] واتە: هەر کەسێك تەبە بکات پێش ئەوەی سەرەمەرگی بێت، خودای گەورە ئەو تەوبەکردنەی لێ وەردەگرێت و قەبوولی دەکات. بە هەمان شێوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **(مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، تَابَ اللهُ عَلَيْهِ)**[2] واتە: هەرکەسێك تەوبە بکات پێش ئەوەی خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵبێت، خودای گەورە ئەو تەوبەکردنەی لێ وەردەگرێت و قەبوولی دەکات.

---

١ــ ئیمامی ئەحمەد و حاکم و ترمزی گێڕاویانەتەوە

٢ــ سەحیحی موسلیم.





# تەوبەیەکی زۆر گەورە

لە(بریدە)وە دەگێڕنەوە کە پیاوێك بە ناوی (ماعز)ی کوڕی (مالك)ی (الاسلمی) هاتە خزمەت پێغەمبەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ستەمم لە خۆم کردوە و زینام کردوە، دەمەوێت پاکم بکەیتەوە لەو گوناهە. پێغەمبەر (ﷺ) گەڕاندیەوە. لە ڕۆژی دواتردا سـەر لەبەیانی هاتەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕاسـتی من زینام کردوە. ئەمجارەیشـیان هەر گەڕاندیەوە. پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ لای کەس و کار و هۆزەکەی فەرمووی (ﷺ) : (ئایا لە ژیری(ئەقڵی)دا هیچ عەیبێك دەبینن، شـتێکی وای لێبەدی دەکەن کە حەزی پێ نەکەن؟) وتیان: نەخێر وای نازانین کە وابێت، بەڵکو بە پیاوێکی عاقڵ و تەواوی دەزانین، لە پیاوباشانی خۆمان دێتە پێش چاومان. بۆ جاری سـێیەم هاتەوە بۆلای و پاشـان دووبارە ناردیەوە بۆ لایان پرسـیاری لێکردن دەربارەی، ئەوانیش دیسـان هەواڵیان پێدایەوە کە هیچ شـك نابەین نە لە خۆی و نەلە ژیریدا. کە جاری چوارەم هاتەوە چاڵێکی بۆ هەڵکەند، پاشـان فەرمانیدا بەرد بارانیان کرد. دەڵێت: ئینجا ئافرەتێکی هۆزی (غامیدی) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من زینام کردوە پاکم کەرەوە. دیسـان ئەمیشـی گەڕاندەوە، بۆ ڕۆژی دواتر هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ دەمگەڕێنیتەوە، ڕەنگە بتەوێت وەك چۆن (ماعز)ت گەڕاندەوە منیش بگەڕێنیتەوە دەبەخوا من سـکم پڕە، خۆشـەویسـت (ﷺ) فەرمووی: (دەهەر نابێت، کەواتە بڕۆ تا منداڵەکەت دەبێت). دەڵێت: کاتێك منداڵەکەی بوو هاتەوە بۆ لای منالەکەی مەلۆتکە کردبوو لە پارچە پەڕۆیەکدا. وتی: ئەمە منداڵەکەیە وا بوومە، فەرمووی (ﷺ) : (دەبڕۆ شـیری پێبدە تا لە شـیر دەیبڕیتەوە). کاتێ لە شـیری بڕیەوە بە منداڵەکەوە هاتەوە بۆ خزمەتی منداڵەکە پارچە نانێکی بەدەستەوە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمە منداڵەکەیە وا لە شیر بڕیومەتەوە و نانەخۆرەش بووە. ئیتر منداڵەکە دەداتە دەسـت پیاوێك لە موسـڵمانەکان، پاشـان فەرمان

دەکات چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنرێت تا سەر سینگی، ئینجا فەرمانی کرد بە خەڵکی و ڕەجمیان کرد، ئا لەو کاتەدا (خالیدی کوڕی وەلید) بەردێکی تێدەگرێت و دەیدا بەسەریدا و خوێن فیشقە دەکات بەسەروچاوی (خالید)دا، ئەویش جنێوی پێدەدات، پێغەمبەریشﷺ گوێی لە جنێوەکەی دەبێت کە پێی دەدات و دەفەرموێت: هێور و لەسەرخۆبە ئەی (خالد)، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم ئافرەتە تەوبەیەکی کرد، ئەگەر پیاوی باجگریش ئەو تەوبەی بکردایە خوا لێی خۆش دەبوو، پاشان فەرمانی پێکرد نوێژی لەسەرکرد و شاردیانەوە.[1] لە گێڕانەوەیەکیتر ئیمامی (عومەر - خوا لێی ڕازیبێت) فەرمووی: **(تصلي عليها يا رسول الله وقد زنت؟ قال :لقد تابت توبة لو قسمت بين سبعين من أهل المدينة لوسعتهم، وهل وجدت أفضل من أن جادت بنفسها لله ؟)**[2] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژت لەسەر کرد، لەکاتێکدا ئەو زینای کردووە! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی ئەو ئافرەتە تەوبەیەکی وای کرد، ئەگەر دابەشی سەر حەفتا کەس لە خەڵکی مەدینە بکەیت بەشی هەموویان دەکات، لەوە باشترت بینیوە کە بەخۆی دان بە هەڵەکەیدا ناو و گەڕایەوە بۆ لای خودای گەورە.

---

١_ سەحیحی موسلیم.

٢_ سەحیحی موسلیم.





## تەوبە تەواوی گوناهەکانی پێشتر دەسڕێتەوە

لەوانەیە کەسێك بپرسێت: دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام چ گەرەنتیەك هەیە کە بەخشش و میهرەبانی خودای گەورە من دەگرێتەوە، ئەوکاتەی کە تەوبە دەکەم ئارەزوومە ڕێگەی ڕاست بگرم و دڵم ئاسوودە و گەش بێت، بەڵام لەبەر ئەو بیرو گومانانەی کە بۆم دێن تووشی گومانم دەکەن بەرامبەر بە بەخشندەیی خودای گەورە، ئەگەر بزانم خودای گەورە لێم خۆشدەبێت بە دڵنیاییەوە تەوبە دەکەم؟!

پێی دەڵێین: ئەو هەستەی کە هەتە و بیری لێ دەکەیتەوە هەمان ئەو هەستەیە کە کەسانی پێشتر پێیدا گوزەریان کردووە، وەکو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) . ئەگەر بە(یەقینی) بیر لەم دوو گێڕانەوەیە بکەینەوە، بەدڵنیاییەوە ئەو هەستەی کە لە دەروونتدایە دەرەوێتەوە(ئەگەر خودا بیەوێت):

**گێڕانەوەی یەکەم:** پێشەوا موسلیم چیرۆکی موسڵمانبوونی (عەمری کوڕی عاسم)مان بۆ دەگێڕێتەوە لە زمانی خۆیەوە و دەفەرموێت: کاتێك کە پەروەردگار، ئیسلامی لەناو دڵمدا خۆشەویست کرد، بە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم، وتم: دەستت بهێنە تا پەیمانت پێ بدەم، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی ڕاستی بەرەو رووم هێنا، بەڵام من دەستم کێشایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی (عەمر) چیت بەسەرهاتووە؟ وتم: دەمەوێت مەرجێکم لەگەڵ بکەیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چ مەرجێك؟ وتم: مەرجەکەم ئەوەیە کە خوا چاوپۆشی بکات لە هەموو گوناهەکانی پێشترم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: **(أَمَا عَلِمْتَ يَا عَمْرو أَنَّ الْإِسْلَامَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ؟ وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا؟ وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ؟)** واتە: ئەی (عەمر) ئایا نازانی کە ئیسلام هەموو ئەوەی پێش خۆی ڕەش دەکاتەوە و کۆچکردنیش ئەوەی پێش خۆی پڕی دەکاتەوە و حەجکردنیش ئەوەی لەبەر خۆیەتی پڕی دەکاتەوە؟






**گێڕانەوەی دووەم:** پێشـەوا موسـلیم لە (عەبدوڵای کوڕی عەباس) دەگێڕێتەوە کە: ژمارەیەك لە کافرەکان کە کوشت و کوشتارێکی زۆریان ئەنجامدابوو و بە ڕاددەیەکی زۆر تووشی زیناو کرداری ناشایستە ببوونەوە، هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتیان: ئەو وتانەی کە دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ دەکەیت زۆر باش و بەسـوودن، هیوادارم وەڵامێکی دڵخۆشـکەرت هەبێت بۆمان سـەبارەت بە کەفارەتی ئەو کردەوانەی کە ئەنجامـمان داون لە پێشـتردا وەك: کوشـتن و زینا و...هتد. لە وەڵامدا ئەم دوو ئایەتانە دابەزین: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨﴾ واتە: کەسـانێکن کە لەگەڵ خوادا ناپەرسـتن هیچ پەرسـتراوێکی تر و ناکوژن هیچ کەسـێك کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بەهەق و ڕەوا نەبێت و زیناو داوێن پیسی ناکەن و هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران) تووشی تۆڵەکەی دێت. ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بە بەزەیی یە.







## ئایا خودای گەورە لێم خۆشدەبێت؟

لەوانەیە بڵێت: دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام چەندەها گوناهم کردووە و هیچ جۆرە خراپەیەك نییە کە نەمکردبێت، هەر گوناهێك کە بە خەیاڵتدا دێت من کردوومە بە رادەیەك کەوا هەست دەکەم چۆن دەبێت خودای گەورە لێم خۆشبێت بەهۆی ئەو هەموو گوناهانەی کە چەندان ساڵە لەسەرم کۆبوونەتەوە.

ئەی هاوڕێی بەرێزم پێت دەڵێم: ئەمە تەنها کێشەی تۆ نییە، بەڵکوو ئەمە کێشەی زۆربەی ئەو کەسانەیە کە دەیانەوێت تەوبە بکەن، نموونەی گەنجێك دەهێنمەوە کە پرسیارێکی لەو شێوازەی کردبوو کە هەر لە سەرەتای هەرزەکارییەوە لە تەمەنی حەڤدەساڵییەوە دەستی بە گوناهکردن کردبوو. چەندین گوناهی قێزەونی گەورە و بچووکی کردبوون، تەنانەت (تەحەدای) دەستدرێژی لە کچێکی بچووك کردبوو و چەندین دزی ئەنجامدابوو، پاشان وتی: گەڕاومەتەوە بۆ لای خودای گەورە، هەندێك شەو دەخەوم هەندێك شەویش شەونوێژ دەکەم و ڕۆژی دووشەممان و پێنجشەممانیش بەڕۆژوو دەبم و دوای نوێژی بەیانیش قورئان دەخوێنمەوە، ئایا تەوبەکەم دروستە؟

پێوەری ئێمەی موسڵمانیش ئەوەیە کە بگەڕێینەوە سەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ، لە داواکردنی حوکمەکان و روونکردنەوە و چارەسەرەکان، کاتێك گەڕانەوە سەر قورئانی پیرۆز دیتمان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥٣ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ۝٥٤﴾[١] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە

---

١_ سورەتی الزمر.







خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بەڕاســـتی هەر ئەوە لێبوردەی بە بەزەیی یە. وە بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان وە گەردن کەچی ئەو بن بەر لەوەی سـزاتان بۆ بێت پاشـان یارمەتی نادرێن (لەلایەن هیچ کەس)ەوە.

ئەمە وەڵامێکی ورد و پوختە بۆ پرسیارەکە و پێویست بە هیچ روونکردنەوەی تر ناکات.

بەڵام هەستکردن بەوەی کە گوناهەکانم زۆر زیاترن لەوەی کە خودای گەورە لێم خۆشبێت، ئەمە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو کەسە:

**یەکەم:** هەر لە سەرەتاوە باوەری بە ڕەحمی خودای گەورە نییە.

**دووەم:** لە ئیمانەکەیدا کەم و کوڕی هەیە، باوەڕی بەوە نییە کە خودای گەورە دەتوانێت لە هەموو گوناهێك خۆشبێت.

**سێیەم:** لاوازی کردەوەیەك لە کردەوەکانی دڵ کە بریتییە لە ئومێدبوون (رجاء) بە ڕەحمی خودای گەورە.

**چوارەم:** ڕەشبینی کەسی گوناهکار لەوەی کە خودای گەورە توانای هەیە هەموو گوناهەکانی بسڕێتەوە.





**ئێستاش وەڵامی هەموو ئەو خاڵانەی سەرەوە دەدەینەوە:**

**یەکەم:** بۆ روونکردنەوەی ئەمە وتەی خودای گەورە بەسە کاتێك دەفەرموێت: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ﴾[1] واتە: وە بەزەیی و ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

**هەرچی خاڵی دووەمیشە:** فەرموودەی قودسی کیفایەتە لەم بارەیەوە کە دەفەرموێت: (**من علم منكم أني ذو قدرة على مغفرة الذنوب غفرت له ولا أبالي ما لم يشرك بي شيئا**).[2]

واتە: هەرکەسێك بزانێت کە من توانام هەیە لە گوناهەکان خۆش ببم، ئەوە لێی خۆشدەبم و هیچ لام گرنگ نییە کە چ گوناهێکی کردووە، بە مەرجێك هیچ هاوبەش و هاوەڵم بۆ بڕیار نەدات. (ئەمەش لە ڕۆژی دواییدایە).

**هەرچی سێیەمە:** با بەم فەرموودە قودسییە گەورەیە چارەسەری بێ ئومێدبوون بکەین: **(يا ابن آدم إنك ما دعوتني ورجوتني غفرت لك على ما كان منك ولا أبالي، يا ابن آدم لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك، يا ابن آدم إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئًا لأتيتك بقرابها مغفرة)** واتە: ئەی نەوەی ئادەم بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە داوات لێم کردوە تکاو رەجات وەها بووە کە لێت خۆش بم لێت خۆش بویمە لەسەر ئەوەی کە چیت کردوە و گوێم پێنەداوە، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر گوناهەکانتان بگاتە هەوری ئاسمان لەپاشان داوای لێ خۆشبوونت لێم کردبێت لێت خۆش بوومەو گوێم پینەداوە، ئەی نەوی ئادەم بێگومان تۆ ئەگەر هاتبیت بۆ لای من لەدوای مردنت پر بەنزیکی زەوی گوناهت لەگەڵ خۆت هێنابێت وە لە پاشانیشدا کە گەیشتیتە من هیچ هاوبەشێکت بۆ من بڕیارنەدابێت منیش نزیکی پر زەوی لێ خۆشبوونت بۆ دێنم.

---

١ــ سورەتی الأعراف.

٢ــ طەبەرانی.







**هەرچی خاڵی چوارەمە:** فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کیفایەتە کاتێك دەفەرموێت: **(التائب من الذنب كمن لا ذنب له)**[1] واتە: پەشیمانبوونەوە لە گوناه و داوای لێخۆشبوونکردن وەك ئەوە وایە هیچ گوناهێکی نەکردبێت.

وە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەوا گوناهی زور گەورەیان هەیە و پێیان وایە خودای گەورە لێیان خۆشنابێت با ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخوێننەوە:

## تەوبەی ئەو کەسەی کە سەد کەسی کوشتبوو

ئەبی سەعید دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:( **كان فيمن كان قبلكم رجل قتل تسعة وتسعين نفسًا، فسأل عن أعلم أهل الأرض فدُل على راهب فأتاه فقال: إنه قتل تسعة وتسعين نفسًا، فهل له من توبة؟ فقال: لا، فقتله فكمل به مائة، ثم سأل عن أعلم أهل الأرض، فدُل على رجل عالم، فقال: إنه قتل مائة نفس، فهل له من توبة؟ فقال: نعم، ومن يحول بينه وبين التوبة؟ انطلق إلى أرض كذا وكذا، فإن بها أناسًا يعبدون الله تعالى فاعبد الله معهم، ولا ترجع إلى أرضك، فإنها أرض سوء، فانطلق حتى إذا نصف الطريق أتاه الموت، فاختصمت فيه ملائكة الرحمة وملائكة العذاب، فقالت ملائكة الرحمة: جاء تائبًا مقبلاً بقلبه إلى الله تعالى، وقالت ملائكة العذاب: إنه لم يعمل خيرًا قط، فأتاهم ملك في صورة آدمي، فجعلوه بينهم -أي حكمًا- فقال: قيسوا ما بين الأرضيْن، فإلى أيتهما كان أدنى فهو له، فقاسوه فوجدوه أدنى إلى الأرض التي أراد، فقبضته ملائكة الرحمة)**[2]

---

١_ ئیبنو ماجە و طەبەرانی.

٢_ بوخاری و موسلیم.



واتە: پیاوێك لەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون نەوەدونۆ کەس دەکوژێت، پرسیار دەکات دەربارەی زاناترین کەس لەسەر زەوی؟ ناونیشانی کابرایەکی(ڕاهب)ی بۆ هەڵدەدەن، ئەویش دێت بۆ لای و دەڵێت: نەوەد و نۆ کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە ئەویش دەڵێت: نەخێر، ئیتر ئەویش دەکوژێت و سەد تەواو دەکات، پاشان پرسیار دەکاتەوە لە زاناترین خەڵکی سەرزەوی، ناونیشانی پیاوێکی زانای بۆ هەڵ دەدەن، دەڵێت ئەوە سەد کەسم کوشتووە ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ دەڵێت: بەڵێ، کێ هەیە ببێتە کۆسپ لەنێوان تو و تەوبەدا؟ بەڵام بڕۆ بۆ خاکی ئەوێ و ئەوێ، لەوێدا کەسانێك هەن خەریکی پەرستنی خوای باڵادەستن، تۆیش بڕۆ خوای باڵادەست بپەرستە لەگەڵیان، مەگەڕێرەوە بۆ خاکی خۆت، چونکە خاکێکی خراپە. ئەویش دەڕوات تا نیوەی ڕێگە دەبڕێت، مردن دامێنگیری دەبێت، فریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی سزا دەبێتە دەمە قاڵە و دەمەتەقێیان لەسەری، فریشتەی ڕەحمەت دەڵێت: کابرا بەتەوبەکاری هاتووە، بەدڵ ڕووی لەخوا کردووە، فریشتەی سزایش دەڵێت: ئەو هەرگیز چاکەی نەکردووە، فریشتەیەك لە شێوەی مرۆڤێکدا دێت بۆلایان، دەیکەن بە ناوبژیوان لە نێوان خۆیاندا، ئەویش دەڵێت: نێوان ئەو دوو خاکە بپێون. بەلای کامیاندا نزیکتربوو ئەوە بۆ ئەوەیانە، پێوایان کاتێ سەیر دەکەن بەلای ئەو شوێنەدا نزیکترە کە ویستوویەتی بۆی بچێت. ئیتر فریشتەی ڕەحمەت گیانی دەکێشێت).

(قتادة) دەڵێت: (حسن) وتوویەتی: وامان بۆ باسکراوە کە کاتێك مردن یەخەی پێدەگرێت سنگی دەباتە پێش. لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە خودای گەورە بەو بەشەی زەوی کە خراپەکتری تێدا کردبوو فەرمووی: دووربکەرەوە و بە بەشەکەی تری زەوی فەرمووی: نزیك ببەرەوە لەو کەسە، دواتر خودای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو هەردوو زەویەکە پێوانە





بکەن، لەو کاتەدا دیتیان ئەو کەسە بە ئەندازەی (زیراعێك)[1] لە خاکی چاکەکارانەوە نزیکتربوو، پاشان خودای گەورە لێی خۆشبوو.

بەڵێ ئەی کەسی تەوبەکار، کێ نێوانی ئەو کەسە تاوانکارە و تەوبەی بەیەك گەیاند! ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت تەوبە بکەیت، پێت وایە گوناهەکانت گەورەترن لەو تاوانکارە کە خودای گەورە تەوبەکەی لێ وەرگرت، دەی ئەم هەموو نائومێدی و دوودڵییەی هەتە لە پای چییە؟

بەڵکوو کارەکە زۆر لەوە گەورەترە، ڕابمێنە لە وتەی خودای گەورە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾﴾[2] واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا ناپەرستن هیچ پەرستراوێکی تر و ناکوژن هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بەهەق و ڕەوا نەبێت و زیناو داوێن پیسی ناکەن و هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران) تووشی تۆڵەکەی دێت. سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا و بێ بڕانەوە بەبێ ڕێزو ڕیسوایی لە دۆزەخ دا دەمێنێتەوە. بێجگە لە کەسێك تەوبەی کردبێت و باوەڕی هێنابێت، کارو کردەوەی چاکیشی کردبێت، ئا ئەوانە خوا خراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە و خوا هەمیشە لێبووردەی بە بەزەیی یە. وە بوەستە لەسەر ئەم فەرموودەیەی خودای گەورە: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٍ﴾[3] واتە: ئا ئەوانە خوا خراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە.

---

١ــ یەك زیراع دەکاتە: ٤٥.٧٢سم. (وەرگێڕ)

٢ــ سورەتی الفرقان.

٣ــ سورەتی الفرقان.





زانایان دەفەرموون گۆڕان (التبديل) لێرەدا دوو جۆرە:

یەکەم: گۆرانی سیفەتە خراپەکان بە سیفەتە باشەکان، وەك ئەوەی هاوبەشدانان و شیرك بگۆڕێت بە ئیمان هێنان بە تاك و تەنهایی خودای گەورە و زیناش بە داوێنپاکی و دروزنی بە ڕاستگۆیی و خیانەتکردن بە دەستپاکی بەو شێوەیە....

دووەم: گۆرینی گوناهەکانی کە لە دونیا کردۆیەتی بە خێر و چاکە لە رۆژی دواییدا، ڕابمێنە لە ئایەتەکەدا: ﴿يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ﴾ واتە: خوا خراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە.

وە نەی فەرمووە: جێگای هەر گوناهێك دەبێتە چاکە، بەڵکو چاکەکە کەمتر دەبێت لە گوناهەکە یان وەك ئەو گوناهە دەبێت یاخوود زیاتر دەبێت لە گوناهەکە، ئەمەش بەپێی ڕاستگۆیی تەوبەکارەکە و جۆری تەوبەکردنەکە، جا فەزڵ و پاداشت لەمە گەورەتر هەیە! سەیری روونکردنەوەی ئەو رەحم و بەزەییەی خودای گەورە بکە لەم فەرموودەیەدا: **جاء شيخ كبير هرم ، قد سقط حاجباه على عينيه فقال : يا رسول اللّه ، رجل غدر وفجر، ولم يدع حاجة ولا داجة إلا اقتطفها بيمينه ، لو قسمت خطيئته بين أهل الأرض لأوبقتهم ، فهل له من توبة ؟ فقال النبي صلى الله عليه وسلم : أأسلمت ؟ فقال : أما أنا فأشهد أن لا إله إلا اللّه وحده لا شريك له وأن محمداً عبده ورسوله ، فقال النبي صلى الله عليه وسلم : فإن اللّه غافر لك غدارتك وفجراتك ، ومبدل سيئاتك حسنات ما كنت كذلك ، فقال : يا رسول اللّه ، وغدراتي وفجراتي ؟ فقال : وغدراتك وفجراتك، فولى الرجل يكبر ويهلل)**[1]. واتە: پیرەمێردێکی بەساڵاچووی پشت چەماوە کە برۆیەکانی چاوەکانی داپۆشیبوو و بەهۆی گۆپاڵەکەیەوە وەستابوو، هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ڕات چییە لەسەر پیاوێك کە تەواوی گوناهەکانی ئەنجامداوە، هیچ شتێکی لە گوناه

١ــ طەبەرانی.







بەجێی نەهێشــتووە لە گوناهی بچووك بگرە تاکوو گوناهی گەورە، بە شــێوەیەك ئەگەر ئەو گوناهانە لە نێوان هەموو خەڵکی ســەر زەوی دابەشــبکرێت، هەموویان بەرەو لەناوچوون دەچن، ئایا کەســێکی وا دەتوانێت تەوبە بکات؟ پێغەمبەری میهرەبان (ﷺ) فەرمووی: ئایا موسڵمانبووی؟ وتی: گەواهی دەدەم کە هیچ پەرســتراوێکی بە حەق و ڕاســتی نییە جگە لە (اللـە) و گەواهی دەدەم کە محەمەد پێغەمبەر و نێردراوی خودای گەورەیە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خودای گەورە تەواوی خراپەکــان و گونــاهەکــانت بۆ دەکــات بە چــاکە و گوناهەکانت بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، ئەگەر بەم شێوەیە بمێنیتەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : هەموو فێڵبازی و فەســـــادییەکانیشـــم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ فێڵبـازی و فەســـادییەکانیشـــت، دواتر ئەو پیرەمێردە بەدەم وتنی (الله اکبر)ەوە ڕۆیشـــت و لەپێش چاوان بزربوو.

لێرەدا لەوانەیە کەسی تەوبەکار بپرسێت: من کاتی خۆی کە کەسێکی سەرگەردانبووم و بەڵاڕێدا چووبوم هەندێك کردەوەی چاکەشم هەبوون ، ئایا ئەو کردەوە چاکانەم بۆ نووسراوە لە لایەن خودای گەورەوە، یاخوود بە بادا چوون؟ بە وردی ئەم وەڵامە بخوێنەوە: (عورووەی کوری زوبەیر) وتی: (حەکیمی کوڕی حیزام) هەواڵی پێ داوە کە بە پێغەمبەرم (ﷺ) وت: **أرأيت أمورا كنت أتحنث بها في الجاهلية من صدقة أو عتاقة أو صلة رحم أفيها من أجر ؟ فقال له رسول الله - صلى الله عليه وسلم -:أسلمت على ما أسلفت من خير)**[1]. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچوونت لەبارەی منەوە چییە کەوا من لە سەردەمی نەزانین(جاهیلیەت) خێر و چاکەم دەکرد، بەندەم ئازاد دەکرد و سیلەی ڕەحمم بەجێ دەگەیاند، ئایا ئەو کردەوانە بۆ من خێرو پاداشت هەیە؟

---

١ــ سەحیحی بوخاری.







پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: **بەهۆی ئەو کردەوە باشانەی کە لە ڕابردوودا ئەنجامت دابوو موسڵمانبووی.**

کەواتە لەو گوناهانە خۆش دەبێت، گوناهەکان دەگۆڕێت بە چاکە و کردەوە چاکەکانی ڕابردووی بۆ دەنووسرێت ئەگەر تەوبە بکات، جا دوای ئەمە چ بیانویەکی تر دەمێنێتەوە!







# چی بکەم ئەگەر گوناهم کرد؟

**لەوانەیە بڵێیت:** گەر تۆشی گوناهێك بووم چۆن یەکسەر واز لەو گوناهە بهێنم؟ لەم حاڵەتەدا هیچ کردەوەیەك هەیە کە بیکەم دوای ئەوەی یەکسەر وازم لە گوناهەکە هێنا؟

**وەڵامەکە ئەمەیە کە: ئەبێت ئەم دوو کردەوەیە بکەیت دوای گوناهەکە:**

**یەکەم:** کردەوەی دڵ، کە بریتییە لە: پڕبەدڵ پێت ناخۆشبێت کە ئەو گوناهەت کردووە و بڕیار بدەیت کە بەهیچ شێوەیەك نەگەڕێیتەوە سەر ئەو گوناهە، ئەمەش لە ئەنجامی ترسانی تۆیە لە خودای گەورە.

**دووەم:** کردەوەی ئەندامەکانی لاشـــە، کە بریتییە لە: کردنی کردەوەی خێر، وەکو نوێژی تەوبە، کە ئەمەش دەقی نوێژەکەیە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: **(ما من رجل يذنب ذنبًا، ثم يقوم فيتطهر، فيحســن الطهور، ثم يســتغفر الله عزَّ وجلّ إلا غفر له، ثم تلا: (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً...)**[1] واتە: هیچ بەندەیەک نیە کاتێک گوناهێکی کرد، پاشـان دەسـتنوێژ بشـوات بە جوانترین شـێوەی دەسـتنوێژ شـوشـتن، پاشـان ڕابوەسـتێت دوو ڕکاعەت نوێژ بکات، پاشـان پەشـیمانی دەرببڕێ بەرامبەر بە خوای گەورە، ئیلا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت. پاشـان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥﴾[2] واتە: وە ئەوانەی کە کاتێت کردەوەیەکی ناشرین دەکەن، یان سـتەم لە خۆیان دەکەن کە یادی خوایان کردەوە، ئینجا داوای لێبووردن دەکەن

---

١ _ ترمزی گێڕایەتەوە و فەرموودەیەکی حەسەنە.

٢__ سورەتی آل عمران.







بۆ گوناهەکانیان ئایا کێ دەبووڕێ لە گوناهەکان بێجگە لە خوا؟ وە بەردەوام نابن لە سەر ئەوەی کە کردوویانە لە کاتێکدا بزانن گوناهە.

لە گێڕانەوەی تردا باس لە هەندێ سیفاتی تری دوو رکاعەتەکە دەکات کە گوناه و تاوان دەسڕنەوە، ئەمە پوختەکەیەتی کە لەم فەرموودەیەدا باسکراوە:

_هیچ بەندەیەک نیە کاتێک گوناهێکی کرد، پاشان دەستنوێژ بشوات بە جوانترین شێوەی دەستنوێژ شوشتن (چونکە گوناهەکان بە دەستنوێژ شوشتن لە ئەندامەکانی لاشە دەڕۆنە دەرەوە)، لە نیشانەکانی دەستنوێژی پوخت و جوان بریتییە لە: وتنی ناوی خوا(بسم اللە) پێش دەستنوێژ شوشتن و زیکر کردن دوای دەستنوێژ شوشتن کە بریتییە لەم زیکرە: **(أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ - اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ - سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)**[1] واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە (اللە) تاکی بێ هاوبەشە، شایەتی دەدەم کە محمدﷺ بەندەو نێردراوی خودایە. ئەی خودای گەورە بمکە بە یەکێک لە تەوبەکاران و یەکێک لە پاکژکراوان. (واتە: وەک ئەوانەی کە تەوبەکارو پاک و خاوێن و بێ گوناه و تاوانن) پاکی و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆیە خوایە، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوون هەر لە تۆ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

-پاشان دوو ڕکەعات نوێژ بکات.

-هەڵەی تێدا نەکات.

-ئاگاداری بێت و فکری تەنها لە ناو نوێژبێت و فکر لە شتی دونیایی نەکاتەوە.

---

١_ ئەم زیکرانە دوای دەستنوێژ پاداشتی زۆر گەورەی هەیە لای خودای گەورە.






-زیکرەکانی ناو نوێژ بە ڕێك وپێکی و بە باشترین شێوە و بە خشوعەوە بکات.
-پاشان داوای لێخۆشبوون بکات لەو گوناهانەی کە کردوویەتی.

**ئەنجامەکەی بریتییە لە:** ئیلا خودای گەورە لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت و بەهەشت بۆ ئەو کەسە مسوگەر دەبێت[1].

پاشان با زۆر کردەوەی باش بکات، (ئیمامی عومەر) خوا لێی رازی بێت کاتێك هەستی کرد کە گوناهی کردووە کاتێك موناقەشەی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کرد لە شەڕی (**الحديبية**)، وتی: دوای ئەو مناقەشانە هەندێك کاری چاکەم کرد، تاکوو ببێتە هۆی کەفارەتی ئەو گوناهانە. بیر لەم فەرموودە سەحیحە بکەرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:( **إِنَّ مَثَلَ الَّذِي يَعْمَلُ السَّيِّئَاتِ ثُمَّ يَعْمَلُ الْحَسَنَاتِ، كَمَثَلِ رَجُلٍ كَانَتْ عَلَيْهِ دِرْعٌ ضَيِّقَةٌ قَدْ خَنَقَتْهُ، ثُمَّ عَمِلَ حَسَنَةً فَانْفَكَّتْ حَلْقَةٌ، ثُمَّ عَمِلَ أُخْرَى فَانْفَكَّتْ أُخْرَى، حَتَّى يَخْرُجَ إِلَى الْأَرْضِ**)[2] واتە: نموونەی ئەو کەسەی کە کردەوەی خراپە بکات پاشان کردەوەی باش بکات وەك نموونەی پیاوێك وایە کە قەلغانێکی بەستبێت، واتە جلی ئاسنی لەبەردابێت، خەریکە ئەو جلە ئەی خنکێنێت، پاشان کردەوەیەکی باش دەکات ئەڵقەیەك لەو قەلغانە دەبێتەوە، پاشان کردەوەیەکی تری چاك دەکات ئەڵقەیەکی تر دەبێتەوە، تاکوو ئەو قەلغانە لێی دەبێتەوە و بەر زەوی دەکەوێت. کەوایە چاکەکردن گوناهبار لە زیندانێکی تەنگ ئازاد دەکات و دەری دەهێنێت بۆ جیهانە بەربڵاوەکەی پەرستنی خودای گەورە.

---

١_ سەحیحی تەرغیب و تەرهیب.

٢_سەحیح جامع.







بەم فەرموودەیە بابەتەکە پوخت دەکەینەوە: - (**جاء رَجُلٌ إلى النَّبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فقال: يا نبيَّ اللهِ، إنِّي أخَذتُ امرأةً في البُستانِ، ففَعَلتُ بها كلَّ شيءٍ غيرَ أنِّي لم أُجامِعْها؛ قَبَّلتُها ولَزِمتُها، ولم أفعَلْ غيرَ ذلك، فافعَلْ بي ما شِئتَ، فلم يَقُلْ له رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ شيئًا، فذَهَبَ الرَّجُلُ، فقال عُمَرُ: لقد سَتَرَ اللهُ عليه لو سَتَرَ على نفْسِه، قال: فأتبَعَه رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ بَصرَه، فقال: رُدُّوه علَيَّ، فرَدُّوه عليه، فقَرَأَ عليه: {وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ} إلى: {لِلذَّاكِرِينَ}، فقال مُعاذُ بنُ جَبلٍ: ألَه وَحدَه أم للنَّاسِ كافَّةً يا نَبيَّ اللهِ؟ فقال: بل للنَّاسِ كافَّةً**)[1]. واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): من ئافرەتێکم لەنێو باخێك دیت و بۆ مەبەستی سەرجێی بۆی چووم، هەموو شتێکم لەگەڵ کرد و ماچم کرد و خۆشی خۆم پێ برد تەنها سەرجێیم لەگەڵ نەکرد، جگە لەوە هەرچم ویست کردم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچی پێ نەوت، پیاوەکە ڕۆیشت، دواتر (ئیمامی عومەر) فەرمووی: خودای گەورە لێی دەشاردەوە ئەگەر ئەو خۆی ئاشکرای نەکردبا، وتی: دواتر پێغەمبەری (ﷺ) سەیری کرد، تاکوو ڕۆیشت، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بانگی بکەن و بۆم بهێننە ئێرە، پاشان هێنایان، ئەم ئایەتەی بۆ خوێند: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤﴾[2] واتە: وە نوێژ ئەنجام بدە لەم سەروو ئەوسەری ڕۆژدا و لە بەشێك لە شەودا، چونکە بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان لادەبەن، ئەوە پەند و ئامۆژگارییە بۆ پەند وەرگران. دواتی (موعازی کوری جەبەل) وتی: ئەم مزگێنیە تەنها بۆ ئەوە یاخوود بۆ تێکڕای خەڵکیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆ هەموو خەڵکە.

---

١ـ بوخاری و موسلیم.

٢ـ سورەتی هود.







## هاوڕێ خراپەکانم چاودێریم دەکەن

لەوانەیە بڵێیت: دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام هاوڕێ خراپەکانم چاودێریم دەکەن لە هەموو شوێنێك و ئەگەر شتێکیان زانی لەسەر ئەوەی کە هەندێ گۆڕانکاری لەمندا ڕوویداوە هێرشم دەکەنە سەر، منیش لەبەرامبەریان هەست بە لاوازی خۆم دەکەم چی بکەم؟

دەڵێین: سەبر بگرە ئەمە سوننەتی خودای گەورەیە کە کەسە (موتتەقییەکان) تاقیدەکاتەوە، تاکوو کەسانی ڕاستگۆ لە کەسانی درۆزن جیاکربکرێنەوە و خاوێن و پیس لە یەکتر جیا ببنەوە. هەر کاتێك ڕێی چاکەکاریت گرتە بەر و جێگیر بویت، شەیتانە (ئینس و جنەکان) هەواڵ بۆ یەکتر دەنێرن و یارمەتی یەکتر دەدەن، تاکوو گومڕات بکەن و لەسەر ئەو باوەڕە پتەوەی هەتە لات بدەن، تۆش بەگوێیان مەکە، ئەوان لەسەرەتادا پێت دەڵێن کە ئەمە تەنها هەواو هەوەسێکە زوو لا دەچێت، ئەوەی سەیرە هەندێك کەس بەو هاوڕێیانەی کە تەوبەیان کردووە دەڵێن: بەم زوانە دەگەڕێیتەوە سەر کارە خراپەکانت! سەیر لەوەدایە کاتێك کەسێکی تەوبەکار تەلەفۆنی هاوڕێکەی داخست و جوابی نەدایەوە، چونکە تەوبەی کردووە و نایەوێت دووبارە گوناه بکاتەوە، دوای ماوەیەکی زۆر تەلەفوونی بۆ دەکاتەوە و دەڵێت: بەڵکوو ئەو وەسوەسەیەی لەسەر لاچووبێت!! خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ٤ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ٦﴾[1] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی. پادشای خەڵکی.پەرستراوی خەڵکی.

---

١ــ سورەتی الناس







لە زیانی وەسوەسەی پەیداکەری خۆ پەنهان کەر. ئەوەی کە وەسوەسە ئەخاتە دڵی خەڵکی. لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد.

## ئایا خودای تۆ لەپێشترە کە بەگوێی بکەیت یان هاوڕێ خراپەکانت؟!

دەبێت تۆ بزانی کە ئەوان لە هەموو شـــوێنێك بەدواتەوەن و هەموو هۆکارێك دەگرنە بەر بۆ ئەوەی لەسەر ڕێی ڕاست لات بدەن و بتگەڕێننەوە سەر کارە خراپەکان.

هەندێك لەو کەسانەی کە تەوبەیان کردووە بۆ منیان گێرایەوە کە کاتێك دەچوونە مزگەوت هاوڕێ خراپەکەی فەرمانی بە سایەقی ئۆتۆمبێلەکە دەکرد کە بەدوامااندا بێت و ئەویش جامی سەیارەکەی دەکردەوە و ئێمەی هاندەدا تا نەچینە نوێژی جەماعەت و واز لە مزگەوت بێنین. ئا لێرەدایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾[1] واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێ و جێ (کە شایەتمانە) لە ژیانی دنیادا و لەڕۆژی دوایشدا و خوا ستەمکارانیش گومڕا دەکات وە خوا هەرچی بیەوێت دەیکات.

هاوڕێ خراپەکانت بەردەوام هەوڵ دەدەن تا ڕابردووی تۆ بەبیرت بهێننەوە و بە هەموو ڕێگەیەك گوناهەکانی ڕابردووت لەپێش چاوت شیرین بکەن( یادگاریەکان، وێنەکان، نامەکان....) تۆش بەگوێیـان مەکە و خۆت لێیـان بپارێزە. چیرۆکـی (کەعبی کوری مـالیکـت) بەبیر دێنمەوە ئەو هاوەڵە ئەزیز و خۆشـــەویســـتە، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە هەموو هاوەڵان کرد کە هەموو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ (کەعب) بپچڕێنن و هیچ کەســـیش قســـەی لەگەل نەکات، تاکوو خودای گەورە فەرمان دەکات، ئەمەش بەهۆی بەژداری نەکردنی لە

---

[1] ــ سورەتی إبراهیم.



جەنگی (تەبووك)دا، پاشای سەرزەمینی (غەسسان) نێردراوێکی نارد بۆ لای (کەعب) و نامەیەکی پێ سپارد کە تێدا هاتبوو:"هەواڵ بە ئێمە گەیشتوە کە هاوڕێکەت ستەمی لەتۆ کردووە، لەکاتێکدا خوا تۆی پابەند نەکردووە لەسەر زەمینێك بە ملکەچی بژی، لەبەر ئەوە پەیوەندیمان پێوە بکە، تاکوو ئێمە میهرەبان بین لەگەڵت و یارمەتیت بدەین".

بەڵێ ئەو کافرە دەیویست کە دڵی (کەعب) بەدەست بهێنێت، تاکوو لە مەدینە کۆچ بکات و لەسەر زەمینی کافر نیشتەجێ ببێت. هەڵوێستی ئەو هاوەڵە خۆشەویستە چی بوو؟

(کەعبی کوڕی مالیك) فەرمووی:"کاتێك ئەو نامەیەم خوێندەوە لە دڵی خومدا وتم: ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی ترە کە خودای گەورە پێم دەکات، پاشان بەرەو ڕووی تەنورێك ڕویشتم و نامەکەم سووتاند". بۆیە ئەی موسڵمان چ کچ بیت یان کوڕ ئەگەر هاوڕێ خراپەکانت نامەی بۆ ناردی تۆش بیسووتێنە، تاکوو ئەبێت بە خۆڵەمێش، باش بزانە کە ئەوە بە ئاگری دۆزەخ دەی سووتێنی.

﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ٦٠﴾[١] واتە: جا دان بەخۆدا بگرە، بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، با ئەوانەی بێ باوەڕن لە (ئایینی) ڕاست لات نەدەن و بێزارت نەکەن.

---

١_ سورەتی الروم.





## ئەوان هەڕەشەم لێ دەکەن

دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام هاوڕێ خراپەکانم هەڕەشەم لێ دەکەن بە بڵاوکردنەوەی گوناهە ئابروبەرەکانم لەناو خەڵکدا و بڵاوکردنەوەی نهێنیەکانم، ئەوان وێنە و بەڵگەیان لایە، منیش نامەوێت پێگە(سومعە)م لەکەداربێت لەناو کۆمەڵگەدا، بۆیە من دەترسم!

**دەڵێم**: بە دارودەستەی شەیتان بڵێ کە پیلانەکانی شەیتان زۆر زەعیفە[1]، بزانە کە پیلانەکانی دارودەستەی شەیتان یەکجار رووبەروت دەبێتەوە، بەڵام لە بەرامبەر جێگیری و پایەدای موسڵمان و سەبرگرتنی زوو لەناو دەچێت و بەرگە ناگرێت.

ئەوەش بزانە ئەگەر بەگوێی ئەوانت کرد و چوویتە سەر کارە خراپە کۆنەکان زیاتر ئالودەت دەکەن بە گوناه و تاوان، بەڵام بەگوێیان مەکە و پەنا بە خودای گەورە بگرە لەوان و بڵێ: (**حسبی الله و نعم الوكيل**). پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر لە گەڵ و هوزێك ترسابا ئەم نزایەی دەخوێند: (**اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ**)[2] واتە: خودایە تۆ دەکەین بە گژیاندا و پەناشت پێ دەگرین لە زەرەر و زیان و خراپەیان.

ڕاستە کە ئەو کەسە لە حالەتێکی خراپدایە و هاوڕێی خراپی هەڕەشەی لێ دەکات بەوەی ئەگەر لەگەڵی نەچێتە دەرەوە وێنەکانی یان دەنگە خەزنکراوەکانی بڵاو دەکاتەوە و ئابڕووی دەبات لای خزم و کەس و کارەکانی، ئەو لە حالەتێکدایە کە قەد هیوا ناخوازی کە بکەویتە ئەو حاڵەتەوە!

---

١ـ ئاماژەیە بۆ ئایەتی ٧٦ی سورەتی النساء.

٢ ـ ئەلبانی سەحیحی کردوە.







ســــەیری هاوەڵانی شــــەیتان بکە چی دەکەن بەرامبەر ئەو گۆرانیبێژ و ئەکتەرانەی کە تەوبەیـان کردووە، دەچن خراپترین بەرهەمیـان دەردێنن و لە بـازاڕ دەی فرۆشــــن، تـاکوو پاڵەپەســتۆیان لەســەر بێت و شــەری دەروونیان لەگەڵ دەکەن، بەڵام خودای گەورە لەگەڵ تەقواکاراندایە، لەگەڵ تەوبەکاراندایە، هەر ئەو دۆســـت و کارســازی موســڵمانانە و بۆ ساتێکیش پشتیان بەرنادات و وازیان لێ ناهێنێت، هەرگیز بەندەیەك کە پەنای بۆ بردووە بە دەســت بەتاڵی نای گەڕێنێتەوە. بزانە کە لەدوای هەموو ناخۆشــیەك خۆشــی دێت و لە دوای هەموو تەنگانەیەك رزگاربوون دێت.

ئەم چیرۆکەش گەواهی دەدات لەسەر ئەو قسانەی کردوومانە ئەی ئەو کەسەی کە تەوبەت کردووە:

ئەویش چیرۆکی هاوەڵی خۆشەویست (مەرسەدی کوری مەرسەد)ە، ئەوکەسەی کە بە نهێنی دیلە موســڵمانەکانی دەگوازتەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە. پیاوێك هەبوو ناوی (مەرســەد کوڕی مەرسـەد) بوو، ئیشـی ئەوەبوو دەچوو دیلەکانی مەککەی دەگوازتەوە بۆ مەدینە (واتە ئەو موســڵمانانەی کافران دەســت بە ســەریان کردبوون لە مەککە پێیان نەدەکرا کۆچ بکەن) دەڵێ: ئـافرەتێکیش هەبوو لە مەککە داوێنپیس بوو، پێیـان دەگوت (عەنـاق) **دۆســتی(مەرســەد)بوو**، جا مەرســەد بەڵێنی دابوو هەر دیلێکی مەککە دەربچێت ڕزگاری بکات و هەڵیگرێت، دەڵێت: چووم تاکوو گەیشتمە بن دیوارەکانی مەککە لە شەوێکی مانگەشەو، لەو کاتەدا(عەناق) هات سێبەرەکەمی دیت، لە تەنیشت دیوار، کە گەیشتە لام وتی: تو (مەرسەد)ی؟ وتم بەڵێ (مەرسەد)م، وتی: سڵاوت لێبێت وەرە ئەو شەو لای ئێمە ڕابوێرە، دەڵێت گوتم: ئەی(عەناق) خوا زینای حەرام کردووە، دەڵێت وتی: ئەی خەڵکینە ئەو پیاوە





بەندەکراوەکانتان ڕزگار دەکات، دەڵێت: چوار کەس کەوتنە دوام خۆم گەیاندە ئەشکەوتێك و چوومە ژوورەوە، هاتنە سەر سەرم، میزیان بەسەردا کردم، بەڵام خوا چاوی کوێرکردن منیان نەبینی، دەڵێت: گەڕانەوە منیش گەڕامەوە، برادەرە بەندکراوەکەم ڕزگار بکەم، هەڵمگرت و پیاوێکی قورس بوو، گەیاندمە ناو گیاو چۆڵی، دەست و قاچم کردەوە، گەیشتینە مەدینە، چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتم ئەی نێردراوی خوا ئایا(عەناق) مارەبکەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێ دەنگبوو و وەڵامی نەدایەوە، تاکوو ئەم ئایەتە دابەزی و فەرمووی: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞ﴾[1] واتە: پیاوی زیناکەر مارەی ناکات تەنها ئافرەتی زیناکەر و ئافرەتی موشریك نەبێت و ئافرەتی زیناکەر مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یا پیاوی موشریك نەبێت، ئەو مارەکردن و شووکردن بە زیناکەرە یاساغ کراوە لەسەر ئیمانداران.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی (مەرسەد) پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخوود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخوود مەشریك مارەی دەکات.

دیتت چۆن خودای گەورە بەرگری لەو کەسانە کرد کە ئیمانیان هێناوە و دەییان پارێزێت و چۆن لەگەڵ چاکەکاراندایە؟

لە خراپترین بارۆدۆخ گەر ئەوەی لێی دەترسای ڕوویدا و هەندێك لە نهێنیەکانت بڵاوبوویەوە و پێویستی بە ڕوونکردنەوەبوو، تۆش بە ڕوونی هەڵوێستی خۆت بۆ کەسانی دەوروبەرت ڕوونبکەرەوە و پێیان بڵێ: ڕاستە من پێشتر گوناهباربووم، بەڵام تەوبەم کردووە و گەڕاومەتەوە بۆ لای خوا، ئێستا چیتان دەوێت؟

---

١ــ سورەتی النور.







بە بیری هەموو موسڵمانێك دێنمەوە کە ئابڕووچوونی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لەبارەگای خوای گەورە ئابڕووت بچێت، ڕیسواییە گەورەکە، تۆ لەبەرامبەر سەد کەس و دووسەد کەس و هەزار کەس و دوو هەزار کەس نابیت، بەڵکو لەبەرامبەری هەموو دروستکراوەکانی خوای گەورەی، لە فریشتە و جنۆکە و مرۆڤەکان لە ئادەمەوە تاکوو دواین کەس.

کەواتە نزای ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) زۆر بکە: ﴿وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ ۝٨٧ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ۝٨٩﴾[1] واتە: وە شەرمەزار و ڕیسوام مەکە لە ڕۆژێکدا کە (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە. ڕۆژێ کە ماڵ و سامان و منداڵ و نەوە سوود ناگەیەنن. بێجگە لە کەسێك بێتە خزمەتی خوا بە دڵێکی ساغ و پاك و خاوێنەوە.

هەوڵبدە قەڵای ئیمانت قایم بکەیت لە کاتە هەستیارەکاندا بەو نزایانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردوونی وەك:

(اللهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِنَا، وَآمِنْ رَوْعَاتِنَا).

(اللهم اجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيْنَا).

(اللهم لَا تُشْمِتْ بِنَا الأَعْدَاءَ وَلاَ الْحَاسِدِيْنَ).

(اللهم اجعل في قلبي نورًا، وفي بصري نورًا، وفي سمعي نورًا، وعن يميني نورًا، وعن يساري نورًا، وفوقي نورًا، وتحتي نورًا، وأمامي نورًا، وخلفي نورًا، واجعل لي نورًا).

(اللهم اغفِر لي ما قدمت وما أخرت، وما أسررت وما أعلنت، وما أنت أعلم به مني، إنك أنت المقدم والمؤخر، لا إله إلا أنت).

(اللهم اغفر لي، وارحمني، وعافني، وارزقني).

(اللهم إني أسألك المعافاة في الدنيا و الآخرة).

---

١ــ سورەتی الشعراء.







## تاوانەکانم ژیانی منیان تاڵکردووە

لەوانەیە بپرسیت ئەوەندە گوناهم کردووە، کە دوای تەوبەکەش هەر پێیان نارەحەتم و خەفەتبار دەبم کاتێك بیر لەو گوناهانە دەکەمەوە، بەشێوەیەك کە ژیانم تاڵ بووە و خۆشی نەماوە، هەرکات بیر لەو گوناهانە دەکەمەوە خەو ناچێتە چاوم و ئوقرەم نامێنێت، ڕێگەی ڕزگاربوون لەم خەفەتانە چییە؟

پێت دەڵێم: ئەی برای موسڵمان ئەم هەستەی تۆ هەتە بەڵگەی ئەوەیە کە تەوبەیەکی ڕاستەقینەت کردووە، خودی ئەو خەفەتانە بەخۆی پەشیمانییە و پەشیمانیش تەوبەیە، بۆیە ئەوەی بەسەرتدا هاتووە، بەچاوی ئومێد و ڕەجاوە سەیری بکە، بە ئومێدی ئەوەی کە خودای گەورە لێت خۆش بووە، بێ ئومێدیش مەبە لە ڕەحمی خودا، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ٥٦﴾[1] واتە: وتی جا کێ لە میهرەبانی پەروەردگاری نائومێد دەبێت بێجگە لە گومڕایان.

(عەبدوڵلای کوری مەسعو)د دەفەرموێت:( **أكبر الكبائر الإشراك بالله، والأمن من مكر الله، والقنوط من رحمة الله، واليأس من روح الله)**[2] واتە: گەورەترینی گوناهەکان بریتییە لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خودای گەورە و نەترسان لە مەکر و سزای خوا و بێ ئومێدبوون و (مەئیوس) بوون لە ڕەحمی خودای گەورە. موسڵمان لە حاڵەتی ترسان لە خوا و ئومێدبوون بە ڕەحمەتەکەی (الخوف و الرجاء) بەرەو لای خودای خۆی دەڕوات، هەندێك جار یەکێکیان بەپێش ئەوی تریان

---

١ــ سورەتی الحجر.

٢ــ عەبدولرەزاق گێڕایەتەوە و هەیسەمی و ابن کەسیریش بە سەحیحیان داناوە.







دەخات، هەرکاتێك گوناهی کرد باڵی ترس بەپێش باڵی ڕەجا دەخات، ئەگەریش تەوبەی کرد باڵی ڕەجا و ئومێد بەسەر باڵی ترس پێش دەخات.

## ئایا دان بە گوناهەکانمدا بنێم لە دادگادا؟

پرسیارکەرێك بە خەمبارییەوە پرسیاری کرد و وتی: دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام دەبێت هەر بڕۆم و دان بە هەموو گوناهەکانمدا بێنم؟ ئایا لە مەرجەکانی تەوبە ئەوەیە کە لە بەرامبەر دادوەر دان بە هەموو ئەو کارانە بنێم کە کردوومەو داوای لێ بکەم کە حەددی شەرعیم لەسەر جێبەجێ بکات؟

ئەگەر بەو شێوەیە بێت کە باست لێوەی کرد چ مانایەك دەمێنێتەوە بۆ ئەو بەسەرهاتانەی کە کەمێك پێش ئێستا خوێندمانەوە لە تەوبەی (ماعز) و ئافرەتەکە و ئەو پیاوەی ئافرەتەکەی ماچ کرد لەناو باخەکەدا!

دەڵێم: ئەی برای موسڵمان، پەیوەندیکردنی بەندەکان لەگەڵ خودای خۆیان بەبێ هیچ واسیتەیەك یەکێکە لە دەستکەوتەکانی ئەم یەکتاپەرستییە گەورەیە، کە خودای گەورە پێی ڕازییە. ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾[1] واتە: هەردەمێك بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من ئەوا بێگومان من لێیانەوە نزیکم، گیرا دەکەم نزای نزاکاران هەرکاتێک هاوار و نزام لێبکەن.

هەرکات باوەڕمان وابوو کە تەوبە تەنها بۆ خودای گەورەیە، ئەوکات ئەبێت بزانین کە دانپێدانانیش تەنها بۆ خودای گەورەیە. لە نزای (سيد الاستغفار)دا هاتووە:**أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ،**

---

١ـــ سورەتی البقرة.







**وَأَبُوءُ بِذَنْبِي**» واتە: دان بە هەموو ئەو نیعمەتانە دەنێم کە بەسەر مندا ڕشتوە و دان بە هەموو گوناهەکانیشمدا دەنێم.

سوپاس بۆ خوا کە ئێمەی موسڵمانان وەك مەسیحیەکان نین کە ئەبێت قەشە هەبێت و پارەی پێ بدەین تا خوا لێمان خۆش بێت و...هەتا دوایی لەم گاڵتەجاریانە، بەڵکو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ﴾[1] واتە: ئایا نەیان زانیوە کە بێگومان هەر خوا تەوبە و پەشیمانی لە بەندەکانی وەردەگرێت. واتە لە بەندەکانی بەبێ هەبوونی واسیتە.

سەبارەت بە دەرکردنی (ئیقامەی حەدد)، ئەگەر نەگاتە لای پێشەوا یان دادوەر، ئەوکات مرۆڤ پابەند نابێت بەو دادوەرییە، تا دان بە گوناهەکانیدا بنێت، ئەو کەسەی کە خودای گەورە ئەوی داپۆشیوە(ستر) کردووە ئاساییە کە ئەو خۆی گوناهەکەی ئاشکرا نەکات، ئەوەندە بەسە کە تەوبە بکاتە لە نێوانی خۆی و خودای خۆی، لە ناوە پیرۆزەکانی خودای گەورە(**الستيِّر**)ە واتە: زاتێك کە حەزی لێیە گوناهی بەندەکانی داپۆشێت. هەرچی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی وەك (ماعز) و ئەو ئافرەتەی کە زینایان کرد، لەگەڵ ئەو پیاوەی کە ئافرەتەکەی ماچکرد لە ناو باغەکەدا(خودای گەورە لە هەموویان رازیبێت) کارێکیان کرد کە لەسەریان واجیب نەبوو بیکەن، بەڵام بەهۆی تامەزرۆییان بۆ پاکبوونەوەیان لەو گوناهانە ئەو کارەیان کرد، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێك (ماعز) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا، لە ئافرەتەکەش لە سەرەتادا، بەهەمان شێوە وتەی (ئیمامی عومەر) بۆ ئەو کەسەی کە ئافرەتەکەی ماچکردبوو لەناو باخەکەدا کاتێك وتی: خودای گەورە

---

[1] ــ سورەتی التوبة.







ئەوی ئاشــکرا نەدەکــرد، ئەگەر بەخــۆی خــۆی ئاشــکرا نەکردبــا، پێغەمــبەریش (ﷺ) لەوکاتەدا بێدەنگ بوو وەك پاڵپشتیەك بۆ قسەکانی.

بۆیە لەسەرت پێویست نییە کە بچیتە دادگا تا بەشێوەیەکی فەرمی دان بە گوناهەکانتدا بنێیت، لە کاتێکدا کە خودای گەورە گوناهەکانتی ئاشکرا نەکردووە، بە هەمان شێوە پێویست ناکات بچیتە لای ئیمامی مزگەوت، تاکوو حەددی شەرعیت لەسەر جێبەجێ بکات، بە هەمان شێوە نابێت پەنا بۆ هاوڕێیەکت ببەیت کە حەددی شەرعیت لێ بدات لە ماڵەوە، وەك ئەوەی لە مێشکی هەندێك کەسدایە.

لێرەدا هەڵوێستی هەندێ نەزانت بۆ دەردەکەوێت بەرامبەر بە هەندێ لەو کەسانەی کە تەوبەیان کردووە کە لێرەدا باسی دەکەین:

-گوناهبارێك ڕۆیشـــت بۆ لای ئیمامێکی مزگەوت کە زۆر نەزان بوو، لای ئەو ئیمامە دانی بەو تاوانانەدا نا کە کردبووی و داوای چارەســـەری لێ دەکرد، ئیمامەکەش وتی: دەبێت سەرەتا بچیت بۆ دادگا و لەوێ دان بە هەموو گوناهەکانتدا بنێی، تاکوو حەددی شەرعیت لەسەر دەربکەن، دواتر بڕیارت لەسەر دەردەکەن، جا کاتێك ئەو بێچارەیە زانی کە ناتوانێت تەحەمولی دادگا و بڕیارەکان بکات، پەشـــیمان بۆیەوە لەو تەوبەیەی کردبووی و گەرایەوە ســەر گوناهەکانی. لێرەدا بەباشــی دەزانم کە داواکارییەکی گرنگ پێشـکەش بە مامۆستایانی ئاینی بکەم و بڵێم: ئەی موسڵمانان زانینی حوکمە شەرعیەکانیش ئەمانەتە، داواکردنیش لە سەرچاوە دروستەکان ئەمانەتە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسَـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾[1] واتە: دەی پرسـیار بکەن لەزانایان ئەگەر

---

١_ سورەتی النحل







ئێوە نازانن. وە دەفەرموێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ٥٩﴾[1] واتە: کەواتە پرسیار لە زاتێك بکە کە بە هەموو شت زاناو ئاگایە. بۆیە مەرج نییە و ناکرێت کە هەموو بانگخوازێك موفتی بێت، نابێت هەموو بانگبێژێت موفتی بێت و حوکمە شەرعیەکان بەسەر خەڵکدا بدات. بەهەمان شێوە نابێت هەر ئەدیب و بانگخوازێك هەر حوکمێکی شەرعیان دیت بیگێڕنەوە و بڵاوی بکەنەوە، موسڵمانانیش بەرپرسیارن لەوەی فەتوا لە کێ وەردەگرن، چونکە ئەمەش بابەتێکی پەرستشییە(تعبدية)، پێغەمبەریش (ﷺ) لە پێشەوای گومڕاکەر ترساوە، یەکێك لە پیاوچاکە پێشینەکان وتویەتی: ئەم زانستە دینە، بۆیە بزانن کە دینەکەتان لەکێ وەردەگرن، بۆیە ئەی موسڵمانان خۆتان لەوە بپارێزن و هەر کێشەیەکتان بۆ هاتە پێش بۆ چارەسەر و وەڵامەکە پرسیار بکەن لەو کەسانەی کە ئەهلی زانستی شەرعین و شارەزا و پسپۆرن لەو بوارەدا.

---

١ــ سورەتی الفرقان.







## هەندێک فەتوای گرنگ بۆ تەوبەکاران

لەوانەیە بڵێیت: دەمەوێت تەوبە بکەم، بەڵام ئەحکامەکانی تەوبە نازانم و پرسیارگەلێکی زۆر بەناو مێشکمدا دەخولێتەوە لەبارەی چۆنیەتی و دروستی تەوبە لە هەندێ گوناه و چۆنیەتی جێبەجێکردنی مافەکانی خودا کە پێشێلمکردوون هەروەها چۆنیەتی گەڕاندنەوەی مافاکانی خەڵک کە دەستم بەسەردا گرتوون.

هیوامان وایە ئەی برای تەوبەکار کە وەڵامی ئەم پرسیارانە ببنە هۆی شکاندنی تێنویەتیت:

**پرسیاری یەکەم: من تووشی گوناه دەبم پاشان تەوبەی لێدەکەم پاشان دیسان نەفسی بەدخووم بەسەرمدا زاڵ دەبێت و دووبارە تووشی گوناه دەبمەوە ئایا لەوکاتەدا تەوبەکەم هاڵدەوەشێتەوە و گوناهی تاوانی یەکەم و دووەمم دەکەوێتەوە سەر؟**

**وەڵام:** زۆربەی زانایان پێیان وایە کە نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناه مەرجێک نیە لەمەرجەکانی دروستی تەوبە، بەڵکوو دروستی تەوبە دەوەستێتە سەر:

-وازهێنان لە گوناهەکە.

-پەشیمانبونەوە لێی.

-بڕیاڕدان لەسەر نەگەرانەوە بۆ سەر گوناهەکە.

ئەگەر هاتوو گوناهەکەی دووبارە کردەوە ئەوا گوناهێکی نوێی ئەنجامداوە و پێویستی بە تەوبەیەکی نوێ هەیە کەواتە تەوبەی یەکەمی دروست بووە.







**پرسیاری دووەم: ئایا تەوبەکردن لەسەر گوناهێک دروستە لەکاتێکدا بەردەوامم لەسەر گوناهێکی تر؟**

**وەڵام:** تەوبەکە دروستە ئەگەرچی بەردەوامیش بیت لەسەر گوناهێکی تر، بەمەرجێک گوناهەکە تەواو جیاواز بێت و هیچ پەیوەندیەکی بە گوناهی یەکەمەوە نەبێت، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک تەوبەی کرد لە ڕیبا خواردن و بەردەوام بوو لەسەر خواردنەوەی (مەی)، ئەوا تەوبەکەی لەسەر ڕیبا خواردن دروستە وبە پێچەوانەشەوە، بەڵام ئەگەر کەسێک لە ڕیبای (فەزل) تەوبەی کرد لە ڕیبای (قەرز) بەردەوام بوو ئەوا تەوبەکەی دروست نییە.

هەروەها کەسێک کە دەیەوێت تەوبە بکات لە مەی خواردن و بەردەوامیشە لە تلیاک کێشان هەروەها کەسێک کە دەیەویت تەوبە بکات لە زینا کردن و بەردەوامیشە لەسەر جۆرەکانی تری زینا، بەمجۆرە تەوبەکە نادروستە، چونکە ئەمانە وازیان لە گوناهێك هێناوە، بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەکان هاوشێوەیە لەگەڵ گوناهێکی تر کە ئەنجامی دەدات.





**پرسیاری سێیەم: پێشتر هەندێک نوێژم لەدەست چووە و هەندێک ڕۆژووشم نەگرتوە و ئەو زەکاتەی لەسەریشم بووە نەمداوە ئایا ئێستا دەبێت چی بکەم؟**

**وەڵام:** بۆ ئەو نوێژانەی کە لەدەستی چووە ئەوا قەزا ناکرێنەوە، چونکە کاتەکەیان بەسەرچووە، قەرەبوو دەکرێنەوە بە تەوبە و زۆر (ئیستیغفار) کردن و زۆر ئەنجامدانی نوێژی سوننەت، بۆ ئەوەی خودای گەورە لێی خۆش بێت. بەڵام بەنیسبەت ئەو ڕۆژوانەی کە لەدەستی چووە، ئەگەر هاتوو کەسەکە موسوڵمان بوو لەو کاتەی ڕۆژووە فەرزەکانی نەگرتووە پێویستە ڕۆژووەکانی بگرێتەوە و بۆ هەر ڕۆژووێک کەدوای خستووە خواردنی هەژاریک بدات هەتاکو داخیلی ڕەمەزانێکی تر دەبێت ئەمەش کەفارەتی دواخستنی ڕۆژووە بەبێ هەبوونی پۆزش(عوزر) و سزاکەی زیاد ناکرێت ئەگەر قەزاکە بکەوێتە ناو ساڵی داهاتوش. لێرەدا دوو نموونە باس دەکەین: نموونەی (أ): کەسێک لە ڕەمەزانی ١٤٠٠ (٣) ڕۆژووی لەدەست چووە لەبەر تەمبەڵی نەیگرتوە و لە ڕەمەزانی ١٤٠١ (٥) ڕۆژووی نەگرتوە، سەرەنجام کەسەکە دوای دوو ساڵ تەوبەی کرد و بۆ لای خودا گەڕایەوە، لەو کاتەدا دەبێت (٨) ڕۆژ بەرۆژو بێت بۆ گێڕانەوەی ئەو ڕۆژووانەی لە دوو ڕەمەزانی ڕابردوو لەدەستی چووە و خواردنی (٨) هەژار بدات. نموونەی(ب): کچێک لە ساڵی ١٤٠٠ دەگاتە حاڵەتی بلوغ و شەرم دەکات هەواڵی بلوغەکەی بداتە خانەوادەکەی لە (٧) ڕۆژی سوڕی مانگانەکەیدا ڕۆژووی گرتوە و پاشان قەزای نەکردۆتەوە پاش ماوەیەک پێی دەزانێت و تەوبە دەکات ئەوا بەهەمان شێوەی جۆرەکەی پێشوو دەبێ (٧) ڕۆژوەکە بگرێتەوە و خواردنی (٧) هەژار بدات.

لێرەدا دەبێت بزانین کە جیاوازی هەیە لەنێوان وازهێنان لە نوێژ و وازهێنان لە ڕۆژوو گرتن، لە نێو زانایان هەندێك زانا ئەڵێن: ئەو کەسەی بە بەبێ هۆ(بە عەمدی) ڕۆژووی نەگرتووە، نابێت ڕۆژووەکە قەزا بکاتەوە. بەڵام ئەو کەسەی زەکاتەکەی نەداوە، واجبە لەسەری کە







زەکـاتەکەی دەربکـات، چونکە ئەمە مـافی خوایە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە مـافی هەژارەکـانە. بۆ زانینی زانیـاری زیـاتر لەسـەر ئەم بـابەتە بگەڕێوە سـەر کتێبی(مـدارج السالکین١/٣٨٣).

**پرسـیاری چوارەم: ئەگەر هـاتوو تـاوانەکە پەیوەنـدی بە مـافی خەڵکەوە هەبوو ئـایا لەم حالەتەدا چۆن تەوبە بکەم؟**

**وەڵام:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێـت **(مَنْ كَـانَـتْ لِأَخِيـهِ عِنْـدَهُ مَظْلِمَـةٌ، مِنْ عِرْضٍ أَوْ مَـالٍ، فَلْيَتَحَلَّلْهُ الْيَوْمَ قَبْلَ أَنْ يُؤْخَذَ مِنْهُ يَوْمَ لَا دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ، فَإِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَـالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَجُعِلَتْ عَلَيْهِ)**[١] واتە: هەرکەسێک سـتەمی لەکەسـێک کردووە، جا نامووس بێت یاخوود هەر شـتێکی تر با ئەمڕۆ گەردنی خۆی پێ ئازا بکات، پێش ئەوەی ڕۆژێکی بەسـەردا بێت کە دینار و درهەمی لێ نییە و گەر کردەوەی چاکەی هەبێت لێی وەردەگیردرێت و ئەگەر چاکەی نەبێت تاوانی ئەو کەسـەی سـتەمی لێ کردووە دەدرێت بەسـەریدا، کەواتە تەوبەکار مافەکەی لەسـەر لادەچێت بە دانەوەی مـافی خـاوەن مـاف، یـاخوود لێی خۆشـدەبێت، بەڵام ئەگەر لێی خۆش نەبوو دەبێت مافەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە.

---

١ـ سەحیحی بوخاری







**پرسیاری پێنجەم: تووشی غەیبەتی کەسانی تر بووم، هەروەها بوهتانم بۆ چەند کەسێک کردووە، کە بێتاوان بوون، ئایا لەکاتی تەوبە کردن پێویستە پێیان بڵێم کە بوهتانم بۆ کردوون یان لە پاشەملێ باسم کردوون؟**

**وەڵام:** لێرەدا بابەتەکە پەیوەندی بە (المصالح)و(المفاسد)ەوە هەیە , ئەگەر هاتوو زانیت دوای ئاگادارکردنەوەیان کە بوهتانت بۆیان کردووە، یاخوود لە پاشەملێ باست کردوون نابێتە هۆی تورە بوون و زیاد بونی ڕق و قین و خەم و خەفەت و بەشێوەیەکی گشتی پێی بڵێ. بۆ نموونە گەر بڵێیت: من ستەمێکم لە جەنابت کردوە و ئێستاش تەوبەم کردوە، تۆش لێم خۆشبە، ئەمە ئاساییە و هیچ کێشەیەکی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر زانیمان دوای ئاگادارکردنەوەی لەوەی کە بوهتانی بۆ کراوە ڕقی هەڵدەستێت و خەم و خەفەتی پێ زیاد دەبێت، کە بەزۆریش ئەمە روودەدات، یان دوای ئاگادارکردنەوەی بە دەستەواژەی گشتی داوای درێژەی بابەتەکەی کرد، لەم کاتەدا پێویست ناکات پێی بوترێت، چونکە ئاینی ئیسلام ڕێگە بە زیادکردنی ئاژاوە و فەساد نادات، وتنی بابەتێک بە کەسێک کە پێش بیستنی ئەو بابەتە ئارام و لەسەرخۆ بووە توورە و تەشەنەی بکات ئەمە دژی شەریعەتی ئیسلامە کە هەمیشە هانی موسوڵمانان دەدات بە خۆشویستنی یەکتر و سنگ فراوانی، یاخوود لەوانەیە وتنی ڕاستی بابەتەکان دوژمنداریەک درووست بکات کە هەرگیز دڵی ئەو کەسەی کە بوهتانی بۆ کراوە خاڵی نەبێت لەو دوژمنداریە.







**لەجیاتی ئەوەی پێی بڵێت با ئەم خاڵانە جێبەجێ بکات:**

١- پەشیمانبونەوە و داوای لێخۆشبوون کردن لە خودا و بیرکردنەوە لە ناشرینی ئەو تاوانەی کە ئەنجامی داوە و بەحەرام دانانی.

٢- کاتێک لە کۆڕێك گوێی لە بوهتان یاخوود غەیبەت دەبێت بەدرۆی بخاتەوە و بەرگری لەو کەسە بکات کە بوهتان یاخوود غەیبەتی کردووە.

٣- بەباشی باسی ئەوکەسە بکات کە پێشتر لەو مەجلسەدا بە خراپە باسی کردووە، هەروەها باسی سیفەتە باشەکانی بکات.

٤- بەرگریکردن لەو کەسەی کە غەیبەتی لێکردووە و بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسەی کە بە خراپە باسی دەکات.

٥-داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات.

ئەی برای موســـــوڵمـان، تێبینی ئەوە بکە کە جیـاوازی هەیە لە نێوان مـافی دارایی و تـاوانە جەســـتەییەکان وغەیبەت و ئاژاوە نانەوە، مافە داراییەکان ســـوودیان هەیە بۆ خاوەنەکانیان و کاتێک مافەکانیان بۆ دەگەڕێتەوە دڵخۆش دەبن، بۆیە نابێت بیانشـــارینەوە بە پێچەوانەی ئەو تاوانانەی پەیوەندی بە نامووس هەیە بە ئاشـــکراکردنی هیچ ســـوودێک ناگەیەنێت، بەڵکو زۆربەی جار دەبنە هۆی زەرەر و درووستبوونی کێشەی کومەڵایەتی.







**پرسیاری شەشەم: ئەوکەسەی کەسێکی کوشتوە بەناهەق چۆن تەوبە بکات؟**

**وەڵام:** بکوژی بە ئەنقەست سێ مافی لەسەرە یەکەمیان مافی خودا و دووەمیان مافی کوژراو و سێیەمیان مافی کەسوکاری کوژراو.

ئینجا مافی خودا بەهیچ شتێک لاناچێت مەگەر بە تەوبە نەبێت هەروەها مافی خاوەنەکانی مردووەکەش بەوە دەبێت کە خۆی ڕادەستی ئەوان بکات جا ئەوانیش یان لێی خۆشدەبن یان دەیکوژن یان پارەی لێوەردەگرن، ئەوەی دەمێنێتەوە مافی کوژراوە کە ناتوانرێت لە دونیادا بدرێتەوە لەم بارەیەوە زانایان دەفەرموون: ئەگەر خودا تەوبەی بکوژی قەبوڵ کرد خودا مافی کوژراوەکەی لەسەر هەڵدەگرێت و مافی کوژراوەکە دەداتەوە بەزیادیشەوە.

**پرسیاری حەوتەم: ئایا دز چۆن تەوبە دەکات؟**

**وەڵام:** ئەگەر ئێستا شتێکی لایە دەبێت بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی و ئەگەر تێکچوبێت یاخوود بەهاکەی دابەزیبێت، بەهۆی بەکارهێنانی یاخوود بە تێپەڕینی کات ئەوا پێویستە زەرەرەکەش بداتەوە یاخوود خاوەنەکەی لێی خۆش دەبێت.





**پرسیاری هەشتەم: هەست بە شەرم و ئیحراجی دەکەم بە بینینی ئەو کەسەی کە دزیم لێکردووە و ناتوانم پێیان بڵێم ئەمە ئەو پارەیەیە کە من لێتانم دزیبوو، کەواتە ناتوانم داوای لێخۆشبونیان لێبکەم، چی بکەم؟**

**وەڵام:** کێشـــە نیە کەوا بگەڕێی بەدوای ڕێگەیەک کەوا ئەو ئیحراجیەت لەســـەر شـــان هەڵگرێت کە ناتوانی ڕووبەڕووی بیتەوە بۆ نموونە: پارەکەی بۆ بنێری لەگەڵ کەسێکی تر و پێی بڵێی کە ناوت نەهێنێت، یاخوود پێی بڵێی ئەم پارەیە کەســـێک بۆتانی ناردووە، یاخوود بە بەرید بۆی بنێریت و پێویســـت ناکات ناوی خۆت ئاشـــکرا بکەیت گرنگ ئەوەیە پارەکە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

**پرسیاری نۆیەم: هەندێ پارەم لە گیرفانی بابم دزیوە، ئێستا دەمەوێ تەوبە بکەم و بە ڕوونی نازانم چەندم دزیوە ناشتوانم بە باوکم بڵێم تاکو پارەکەی بۆ بگەڕێنمەوە، چی بکەم؟**

**وەڵام:** دەبێت بە شێوەی گریمانی پارەکە دیاری بکەیت، ئەوەی گومانی بۆ دەبەیت، ئەگەر کەمێک لەوە زیاتریش بێت کێشە نیە و ئەگەر پارەکە بە نهێنی بۆ باوکت بگەڕێنیتەوە ئاسایيە بێ ئەوەی ئاگای لێبێت.







**پرسیاری دەیەم: هەندێك پارەم لە خەڵكانێك دزیوە و ئێستاش تەوبەم كردووە، بەڵام ناونیشانیان نازانم، چی بکەم؟**

**وەڵام:** دەبێت بەدوایاندا بگەڕێیت بەپێی توانا، ئەگەر دۆزیتەوە ئەوا پارەکەی بگەڕێنەوە و سوپاسی خوا بکە، ئەگەر خاوەنەکەیت نەدۆزیەوە دەبێت بە میراتگرەکانی بدەیتەوە، بەڵام ئەگەر نەیدۆزیەوە دوای گەڕانێکی جددی، دەبێت پارەکە بکرێتە خێر بۆ خاوەنەکەی و نیەتیشی لە جیاتی بهێنێت، گەرچی کافریش بن، هەروەها (ئیبنولقەییم) بابەتێک باس دەکات لە (المدراج) دا کە هاوشێوەی ئەم بابەتەیە ئەویش ئەوەیە: دوو پیاو لە سوپای موسوڵمانان هەندێک لەو غەنیمەتەی دەست موسوڵمانان کەوتووە دەدزن دوای ماوەیەک تەوبە دەکەن و ئەو شتەی کە دزیویانە دەگەڕێننەوە بۆ لای پێشەوای سوپا، ئەویش دەڵێت: چۆن بگەم بە هەموو ئەندامانی سوپا لەکاتێکدا زۆربەیان لەناو سوپا نەماون، پاشان ڕازی نابێت لێیان وەرگریتەوە، یەکێک لەو پیاوە تەوبەکارانە کە ناوی (حجاجی کوڕی شاعیر) بوو وتی ئەی پێشەوای بڕواداران خودا ئاگادارە بە سوپاکە و ناوەکانیان دەزانێت، پێنجیەکی بدە بە خاوەنی پێنجیەک و ئەوەی دەمێنێتەوە بیکە بە خێر، بەڕاستی خودا پێیان دەگەیێنێت و پاشان ئەنجامیاندا. کاتێک هەواڵەکە گەیشتە (معاویە) وتی: ئەگەر من ئەو فەتوایەم دابا لام خۆشەویستردەبوو لە نیوەی دەسەڵاتم، (ئیبنولتەیمیە)ش فەتوایەکی هەیە کە زۆر نزیکە لەم فەتوایە.





**پرسیاری یانزدەیەم: دەستم بەسەر هەندێک لە ماڵی هەتیوێک داگرت و پاشان بازرگانیم پێوەکرد و قازانجم کرد و پارەکە بووە چەند ئەوەندە، ئێستاش لە خوا دەترسم و تەوبەمکردوە، چی بکەم لەو پارەیە؟**

**وەڵام:** زاناکـــان لەم بـــارەیەوە چەنـــد ڕایەکیـــان هەیە و باشـــترینیان بـــریتییە لەوەی ســەرەتا ئەو بــڕە پــارەی کە لێــی بــردووە بــۆی بگەڕێنێــتەوە، پاشــان نیــوەی قــازانجەکەی بـــداتێ ئەمەش وەک ئەوە وایە پـــێکەوە بەژداری پڕۆژەیەکـــی بازرگانیـــان کردبێـــت، بەڵام دەبێـــت داهـــاتەکەی(رأس المـــال)ەکەی بـــۆ بگەڕێنێـــتەوە ئەمە ڕای (ئەحـــمەدی کـــوڕی حەمـــبەل) و (ئیبنـــولتەیمیە)و قوتـــابیەکەی(ئیبنولقەییم)یش ئەم ڕایە بە پەســـەند دەزانێت.

بۆ نموونە: ئەگەر وشترێک بوو، پاشان بێچوەکی بوو، ئەوا دەبێت وشترەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە و بێچوەکەش نیوە بۆ خۆی و نیوەش بۆ خاوەنی وشترەکەیە.

**پرسیاری دوانزدەیەم: پیاوێک لە کۆمپانیایەکی گواستنەوەی ئاسمانی کاری دەکرد ، زۆربەی جـار هەنـدێك كەلوپەلیـان لەلا دەمـایەوە، ئەویش لەنـاو كەلوپەلە بەجێمـاوەكـان ڕادیۆیەکی دزی، بەڵام پاش چەند ساڵێک تەوبەی کرد ئایا دەبێت ڕادیۆیەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە، یاخوود نرخەکەی یان شـتێکی هاوشـێوەی، چونکە ئەمجۆرە رادیۆیە مۆدێلی نەماوە لە بازار؟**

**وەڵام:** دەبێت نرخی ڕادیویەکە بگەڕێنێتەوە، هەروەها قەرەبوی ئەوەش بکاتەوە کە لەنرخی ڕادیویەکە کەمبووتەوە، بەهۆی بەکارهێنانی یاخوود تێپەڕینی کات، بەڵام ئەگەر نەیتوانی خاوەنەکەی بدۆزێتەوە، دەبێت بڕی ئەو پارەیە بکاتە خێر بۆ خاوەنەکەی.







**پرسیاری سێزدەیەم: هەندێک پارەی ڕیبام لەسەرە و هەمووشم سەرفکردوە هیچی لێ نەماوە، بەڵام من ئێستا تەوبەم کردوە دەبێت چی بکەم؟**

**وەڵام:** تەنها لەســـــەرت پێویســـــتە تەوبە بکەیت و بگەڕێیتەوە بۆ لای خودا بە تەوبەیەکی ڕاســتگۆیانە ، ڕیبا زۆر ترســناکە، ڕێگە نەدراوە بە جەنگ کردن لەگەڵ هیچ کەسـێک بێجگە لە ڕیباخۆرەکان، بەڵام کە پارەی ڕیباکەت هەمووی سەرف کردووە پێویست بە هیچ ناکات تەنها تەوبەیەکی ڕاسگۆیانە نەبێت.

**پرسیاری چواردەیەم: سەیارەیەکم کڕی بە پارەیەک کە هەندێکی حەرام بوو هەندێکیشی حەڵاڵ، ئێستا سەیارەکەم ماوە دەبێت چی بکەم؟**

**وەڵام:** هەرکەسێک شتێکی حەرامی کڕیوە کە بەش ناکرێت و بەشێکی حەرام بێت و بەشـێکیشــی حەڵاڵ، وەک ســەیارە و خانوو، دەبێت بەشــە حەرامەکەی لێدەربکات پاشــان بیکاتە خێر، بەڵام ئەگەر بەشــە حەرامەکە بەشــی خەڵک بوو ئەوا دەبێت بگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی.





**پرسیاری پانزدەیەم: چی لەو پارەیە بکەم کە دەستم کەوتوە لە فرۆشتنی جگەرە، بۆ ئەوەی سامانەکەی ترم پاک ببێتەوە لە حەرام؟**

**وەڵام:** هەرکەسێک بازرگانی بکات بە کاڵای حەرام، وەک ئامێرە مۆسیقیەکان و جگەرە و هتد.. حوکمەکەشی بزانێت، ئەوا لە کاتی تەوبەدا دەبێت ئەو پارەیەی لە حەرام دەستی کەوتووە بیکاتە خێر بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لەو حەرامە، چونکە خودا پاکە و تەنها پاکیش قەبوڵ دەکات، بەڵام ئەگەر ئەم پارە حەرامەی تێکەڵبوو لەگەڵ کۆمەڵێک پارەی تری حەڵاڵ وەک بەقاڵ کە جگەرە دەفرۆشێت و هەندێک کەلوپەلی تری حەڵاڵیش دەفرۆشێت، دەبێت بە ئیجتهادی خۆی بڕە پارەکە دیاری بکات، وا باشترە کەمێک زیاتر بێت لە گومانی خۆی، بۆ ئەوەی سامانەکەی پاک بێتەوە لە حەرام، بەمەش خودا بۆی قەرەبوو دەکاتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی هەرکەسێک پارەی دەسکەوێت لە کەلوپەلی حەرام و ویستی تەوبەی هەبێت ئەوا ئەگەر هاتوو:-

١-کافر بووبێت لەکاتی بەدەست هێنانی پێویست ناکات لە کاتی تەوبەدا پارەکە بداتەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لە هاوەڵان نەکرد کە پارەی حەرام لەماڵیان دەرکەن کاتێک کە موسوڵمان بوون.

٢-بەڵام ئەگەر لەکاتی بەدەستهێنانی پارە حەرامەکە موسوڵمان بووبێت و ئاگاداریش بووبێت کە حەرامە دەبێت پارەکە دەربکات لە کاتی تەوبەدا.




**پرسیاری شانزدەیەم: کەسێک کە بەرتیل وەردەگرێ پاشان خودا هیدایەتی داوە و تەوبەی کردوە، ئێستا چی لەو پارەیە بکات کە بە بەرتیل وەری گرتوە؟**

**وەڵام:** ئەم بابەتە لەم دوو حاڵەتە زیاتر نییە:

١-یا ئەوەیە بەرتیلی لە کەسێک وەرگرتوە کە ئەو کەسە هیچ چارەیەکی نەبووە بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆی بۆیە پەنای بردووە بۆ بەرتیل، پێویستە لەسەر کەسی تەوبەکار پارەکە بگەڕێنێتەوە بۆ کەسی بەرتیل دەرەکە لەبەر ئەوەی ستەمی لێ کردووە بەناچاری پەنای بۆ بردووە.

٢-یان ئەوەیە کە بەرتیلی وەرگرتبێت لە کەسێکی تاوانبار کە هەوڵی بەدەستهێنانی شتێکی داوە کە مافی خۆی نییە، لەم حاڵەتەدا نابێت پارەکە بۆ کەسی بەرتیل دەر بگەڕێنیتەوە، بەڵکو دەبێت پارەکە بکرێتە خێر و بدرێت بە هەژاران، هەروەها دەبێت تەوبە بکات کە ئەو پارەیەی سەرفکردووە لە خۆی و خێزانی.







**پرســیاری حەڤدەیەم: هەندێک کاری حەرامم ئەنجامداوە لە بەرامبەدا پارەم وەرگرتووە لەخەڵک ئایا پێویستە ئەو پارەیە بگەڕێنمەوە بۆ خاوەنەکانیان کە تەوبەم کردووە؟**

**وەڵام:** ئەوکەسـەی توشـی کـاری حەرام بـووە یـان هەنـدێك خزمەتگـووزاری حەرامـی پێشکەشـــکردووە و لەبەرامـــبەردا پـــارەی وەرگرتـــوە ئەوا لەکـــاتی تەوبە کـــردن، پێویســـتە خـــۆی رزگـــار بکـــات لەو مـــاڵە بـــۆ نمـــوونە بیـــداتە هەژاران، نابێـــت بـــۆ خاوەنەکانییان بگەڕێنیتەوە.

بۆیە ئافرەتی زیناکار کە پارەی دەســـکەوتووە لەو ڕێگەیەوە، پێویســـت ناکات پارەکەی بگەڕێنێتەوە بۆ زیناکەر لەکاتی تەوبەکردندا، هەروەها ئەو گۆرانیبێژەی کە لەو ڕێگەیەوە پارەی دەست کەوتووە، پێویست ناکات پارەکەی بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەن ئاهەنگەکە هتد....، هۆکـارەکەش ئەوەیە ئەگەر پـارەکە بگەرێتەوە بۆ گونـاهبـار ئەوا دوو گونـاهـی بۆ کۆ دەبێتەوە: یەکەمیان کارە حەرامەکە، دووەمیان ئەو پارەیەی کە لێی ســـەرفکردووە، ئەمەش ڕای (ئیبنولتەیمیە) و رای (ئیبنولقەییم)یش بووە و لە کتێبی(المدراج)دا هاتووە.







**پرسیاری هەژدەیەم: بابەتێک هەیە کە زۆر بێتاقەتم دەکات و ناهێڵێت شەوان خەو بچێتە چاوانمەوە، ئەویش ئەوەیە کە زینام لەگەڵ ئافرەتێک کردووە، چۆن تەوبە بکەم، ئایا دروستە زەواجی لەگەڵ بکەم بۆ ئەوەی بابەتەکە بشارمەوە؟**

**پرسیارێکی تر: کەسێک توشی زینا بووە لە دەرەوە و ئافرەتەکەش لێی دووگیان بووە ئایا ئەو منداڵە بە منداڵی پیاوەکە حیسابە و پێویستە (نەفەقەکەی) بدات؟**

**وەڵام:** زۆر پرسیارت کرد سەبارت بە تاوانی داوێن پیسی، بەڕاستی پێویستە لەسەر موسوڵمانان بە خۆیاندا بچنەوە و بارودۆخی خۆیان چاک بکەن بەپێی قورئان و سوننەت، بەتایبەت لەو بابەتانەی وەک پاراستنی چاو و بە تەنیا نەبوون لەگەڵ ئافرەتاندا و تەوقە نەکردن لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەم و دەستگرتن بە حیجابی شەرعی و سەفەرنەکردن بۆ وڵاتی کافران بەبێ هۆ و گرینگی دان بە خێزانی موسوڵمانان و پەلەکردن لە زەواج و سەرکەوتن بەسەر سەختیەکاندا.

سەبارەت بەو کەسەی تووشی زینا بووە خۆی لەو دوو خاڵە دەبینێتەوە:

١- ئەگەر بەبێ ڕەزامەندی ئافرەتەکە زینای لەگەڵ کردبێت، دەبێت مارەییەکەی بدات وەک قەرەبوەک بۆ ئەو دەستدرێژیەی کراوەتە سەری و دەبێت تەوبەیەکی ڕاستگۆیانەش بکات و (حەددەکەی) جێبەجێ بکرێت ئەگەر بابەتەکە گەیشتە ئیمام یان نوێنەرەکەی جا چ قازی بێت یان کەسێکی تر(المدراج ١/٣٦٦).

٢- یاخوود زیناکە بە ڕەزامەندی ئافرەتەکە بووە، بەمەش تەنها تەوبەی دەکەوێتە سەر و بەهیچ شێوەیەک منداڵەکە نادرێتە پاڵی ئەگەر هاتوو لەو زینایە منداڵ هاتە کایەوە و پێویست ناکات



نەفەقەی منداڵەکە بدات بەڵکو منداڵەکە دەدرێتە پاڵ دایکی، دەبێت بەخێوی بکات ونابێت بدرێتە پاڵ نەسەبی باوکی. مەرج نیە لەسەر تەوبەکار کە زەواج لەگەڵ زیناکارەکە بکات بۆ داپۆشینی بابەتەکە، خودای گەورە لە قورئان دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ﴾[1] واتە: پیاوی زیناکەر مارەی ناکات تەنها ئافرەتی زیناکەر و ئافرەتی موشریك نەبێت و ئافرەتی زیناکەر مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یا پیاوی موشریك نەبێت.

ئافرەتێک کە حەملی هەیە نابێت گرێبەستی مارەیی ببەستێت، هەروەها ئەو ئافرەتەش ناتوانێت گرێبەست ببەستێت کە دڵنیا نیە ئاخۆ حەملی هەیە یان نا، بەڵام ئەگەر پیاوەکە و ئافرەتەکە تەوبەیەکی ڕاستگۆیان کرد و دڵنیابوون کە ئافرەتەکە دووگیان نییە، ئەوکات دەتوانن زەواج بکەن و ژیانێکی نوێ دەسپێبکەن، خوداش خۆشی دەوێن و چاوپۆشی لە گوناهەکانیان دەکات.

**پرسیاری نۆزدەیەم: لەگەڵ ئافرەتێک توشی زینا بووم، پاشان زەواجم لەگەڵ کرد، هەردوکمان تەوبەمان کردوە ، ئێستا دەبێت چی بکەین؟**

**وەڵام:** مادام هەردووکتان تەوبەیەکی ڕاسگۆیانەتان کردووە تەنها پێویستە عەقدی زەواجەکە نوێ بکەنەوە بە مەرجە شەرعیەکانەوە و بەئامادەبوونی سەرپەرشتیاریان(وەلی ئەمر) و گەواهی دەرەکان(شاهد)، پێویست ناکات بابەتەکە بچێتە دادگا.

---

[1] ـ سورەتی التوبة.





**پرسیاری بیستەم: ئافرەتێک دەڵێت: زەواجم لەگەڵ پیاوێکی ساڵحدا کردووە، پێش زەواج بکەم تووشـــی هەندێك گوناه بووم، کە خودا پێی ناخۆشـــە و ویژدانم ئارام نییە و ئێســـتا پەشـــیمانم لەو کارانەی کردوومە، پرســـیارەکە ئەوەیە ئایا پێویســـتە پێی بڵێم لە ڕابردوودا چیمکردوە؟**

**وەڵام:** پێویست ناکات نە ئافرەت نە پیاو باس لەو شتانە بکەن کە لە ڕابردوو تووشی بوونە و هەرکەســـێک تووشـــــی ئەم دوو دڵیە بوو ئەوا چۆن خودا (ســـــەتری) کردووە ئەویش با ئاشکرای نەکات، تەنها لەسەریەتی تەوبەیەکی ڕاستگۆیانە بکات.

بەڵام ئەگەر کەســێک هاوســەرگیری لەگەڵ کچێــک کــرد و لەشــەوی زاوایەتیــدا بــۆی دەرکەوت کە کــچ نیــیە، بــۆی هەیە ئەو مــارەییەی کە پێــی داوە لێیــوەرگرێتەوە و بەجێــی بهێڵێــت، بەڵام ئەگەر ئــافرەتەکە تەوبەی کــرد و خــودا (ســـەتری) کـــرد پیـــاوەکەش هێشـــتیەوە و تەڵاقـــی نەدا ئەوا پاداشـــتی پیـــاوەکە زۆر مەزنە و خـــودا پاداشتەکەی پێ دەداتەوە.

**پرسیاری بیست و یەکەم: چی لەسەر ئەو کەسە پێویستە کە نێربازی کردووە؟**

**وەڵام:** پێویستە لەسەر هەردوو لایەنەکە کە تەوبە بکەن تەوبەیەکی مەزن و ڕاستگۆیانە، ئەوان نازانن خودا چ بەڵایەکی بەسەر گەلێکدا هێنا کە تووشی ئەم گوناهە بوون لە گەلی(لوط)(علیه السلام):

١- خودا چاوەکانیانی کوێر کرد، وەک لە قورئاندا هاتووە:﴿فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ﴾

٢- دەنگێکی سامناکی بۆ ڕەوانە کردن.

٣- سەرزەمینەکەیانی سەراوژێر کرد.

٤-بەردباران کران بەبەردێك لە خاکی سوورکراو و لەناوبران.

بۆیە ئەو سزایەی دەسەپێنرێت لەسەر ئەنجامدەرانی ئەم گوناهە بریتییە لە کوشتن جا چ خێزاندار بێت یان نا. هەروەک لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتوە: (**مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ، وَالْمَفْعُولَ**)[١]. واتە: هەر کەسێکتان دیت کردەوەی گەلی لوطیان دەکرد، بکەرەکە و کار لەگەڵ کراوەکە بکوژن.

١_ ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.



**پرسیاری بیست و دووەم: تەوبەم کردووە بۆ لای خودا، بەڵام هێشتا هەندێک شتم لا ماوە، وەک ئامێرە مۆسیقیەکان و سیدی و فیلم، ئایا دەکرێت بیانفرۆشم ،چونکە پارەیەکی زۆر دەکەن؟**

**وەڵام:** رێگە پێدراو(جائیز)نیە شتە حەرامەکان بفرۆشرێن و پارەکەی حەرامە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت:(**إِنَّ اللَّهَ إِذَا حَرَّمَ شَيْئًا حَرَّمَ ثَمَنَهُ**)[1] واتە: ئەگەر خودای گەورە شتێکی حەرام کرد ئەو داهاتەی بەهۆی ئەو شتەوەش حەرامە کە بەدەستی هێناوە.

هەرشتێک کە بزانی بەرامبەرەکەت لە حەرام بەکاری دەهێنێت فرۆشتنی حەرامە، چونکە خودای گەورە رێگری لێکردوە و دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ﴾[2] واتە: وە کۆمەکی یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و دەست درێژی.

ئەگەرچی هەندێك پارە لە دونیا زەرەر دەکەی ئەوەی لای خودایە باشترە و بۆ هەتایە دەمێنێتەوە. خودا قەرەبوی دەکاتەوە چ لە دنیادا بێت چ لە رۆژی دواییدا بێت.

---

١_ ئەبو داود گێڕاپتەوە و فەرمودەیەکی سەحیحە.

٢_ سورەتی المائدة.



**پرسیاری بیست و سێیەم: من مرۆڤێکی گومڕابووم، فکرەی عەلمانیم بڵاو دەکردەوە، چیرۆک و بابەتی ئیلحادیم دەنووسی بۆ بڵاوکردنەوەی داوێنپیسی و سەرپێچی خودا، پاشان خودا رەحمی پێکردم و دەری کردم لە تاریکی بۆ ڕووناکی و هیدایەتی دام، ئێستا چۆن تەوبە بکەم؟**

**وەڵام:** سوێند بەخوا ئەوە نیعمەتێکی مەزنە کە خودا هیدایەتی داویت و سوپاس بۆ خودا و داوا لە خودا دەکەم جێگیرت بکات لەسەر ڕێگەی حەق،

بەڵام ئەوکەسەی زمان و پێنووسەکەی بەکارهێناوە لە دژی ئیسلام و لەبەرژەوەندی بیروباوەڕە هەڵەکان، یاخوود بۆ نووسینی (بیدعە)[1]ی گومڕاکەر و خراپە و سەرپێچی خودا ئەوا پێویستە لەسەری:-

١-دەبێت تەوبەیەکی ئاشکرا بکات لە هەموو ئەو بوارانەی کە هەڵەی تێدا کردووە، هەروەها ئاشکراکردن و دەستبەرداربوون لەو فکرەو ڕێبازەی کە هەیبووە بۆ ئەوەی ئەوانەی بە هۆی ئەوەوە گومڕاکراون تێبگەن لە هەڵە و گومڕاییەکانی و ڕوون و ئاشکرا بکرێت بۆ ئەوانەی پێی خەڵەتاون، بۆ ئەوەی دوای گومانەکانی نەکەون، ئەم ئاشکراکردنە واجبێکە لە واجبەکانی تەوبە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٠﴾[2] واتە: مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان بوونەوە و کردەوەی باشیان کردبێت و (ئەوەی شاردبوویانەوە) ئاشکرایان کردبێت، ئا ئەوانە پەشیمانیان لێ گیرادەکەم و هەر منم گیراکەری میهرەبان.

---

١_ واتە: شتێك لە دیندا نەبێت و بکرێتە دین بەسەر خەڵکییەوە.

٢_ سورەتی البقرة.





٢-زمان و پێنووسەکەی لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام بەکاربهێنێت و هێز و توانای خۆی بەکار بهێنێت لەسەرخستنی دینی خوا و هاندانی خەڵکی بۆ ڕێگەی ڕاست و بانگەواز کردن بۆی.

٣-ئەو توانایەی کە هەیەتی بەکاری بهێنێت بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنەکانی ئیسلام و ئابرۆ بردنیان و ئاشکراکردنی پلانەکانیان، هەروەک پێشتر کە یارمەتی ئەوانی داوە سەری دەخستن و گومانەکانی دوژمنانی ئیسلام بەدرۆبخاتەوە، هەروەها ببێتە شمشێرێک بەدەست ئەهلی هەق دژی ئەهلی(باطل)، هەروەها باوەڕی(قەنەعەتی)بە هەر کەسێکی کردبێت کە شتێکی حەرام حەڵاڵە بۆ نموونە: حەڵاڵکردنی (ڕیبا) کەوا سودێکی ڕێگەپێدراوە ئەوا پێویستە پاشگەزبێتەوە لێی و ڕوونی بکاتەوە، تاکوو هەمووان بزانن بەهەڵەداچووە، هیدایەتیش بەدەست خودایە.





## لە کۆتاییدا دەڵێم:

ئەی بەندەی خوا! خودای گەورە دەرگای تەوبەی کردووتەوە، باشتر نییە کە بەرەو رووی بچین؟ **(إِنَّ لِلتَّوْبَةِ بَابًا عَرْضُ مَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْهِ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، وفي رواية عَرْضُهُ مَسِيرَةُ سَبْعِينَ عَامًا، لَا يُغْلَقُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا)**[1] واتە: تەوبە دەرگایەکی هەیە فراوانی نێوانی هەردوو لای دەرگاکە وەك دووری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وایە، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پانتاییەکەی ماوەی بڕینی حەفتا ساڵ ڕێیە، ئەم دەرگایەش داناخرێت، تاکوو ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێت.

خودای گەورە بە بەندەکانی دەفەرموویت:( **يَا عِبَادِي! إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ)**[2] واتە: ئەی بەندەکانم! ئێوە بە شەو و بە ڕۆژ گوناه و تاوان دەکەن، منیش لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبم، دەی کەوایە داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن تا لێتان خۆشبم.

خودای گەورە لەشەودا دەستەکانی دەکاتەوە، تاکوو لەو گوناهانەی لە رۆژ کراون خۆش بێت ، بە ڕۆژیش دەستەکانی کراوەن، تاکوو لەو گوناهەی لە شەودا کراون خۆش بێت. ئای خوایە چەند جوانەی وتەی تەوبەکار کاتێك دەڵێت:" ئەی خودای گەورە، چونکە تۆ بە عیزەتی و بڵندی، منیش زەلیلی قاپی ڕەحمەتی تۆم، دەسا ئەی خوایە بەزەیت پێمدا بێتەوە. داوات لێ دەکەم بەو هێزو دەسەلاتەی هەتە و بەو زەعیفیی و لاوازییەی من تێدام، بەو دەوڵەمەندییەی کە خاوەنیتی و بەو هەژارییەی کە بەندە تێیدایە، وا ئەم نێوچەوانە بەدکار و گوناهبارە لەبەردەم قاپی میهری

---

١ــ سەحیح جامع.

٢ــ سەحیحی موسلیم.





تۆ وەستاوە و داوای بەزەیی و سۆزی تۆ دەکات، بەندەکانی تۆ گەلێك زۆرن، بەڵام من نە سەرکردەیەکم هەیە نە پەناو داڵدەدەرێك جگە لەتۆ، داوات لێ دەکەم وەك بەندەیەکی بێ دەسەڵات و بێ کەس، وە بە ملکەچی و کڵولیەوە بەرەو ڕووت دێم، داوات لێ دەکەم وەك کەسێکی ئاتاج بە ڕەحمەتی تۆ، داوات لێ دەکەم بە ملکەچی و چاو بە گریانەوە کە لێم خۆشبی و گوناهەکانم بسڕیتەوە".

**گوێ لەم چیرۆکە کاریگەرە بگرە:**

دەگێڕنەوە پیاوچاکێك بە ڕێگەیەکدا ڕۆیشت دیتی کە دەرگای ماڵێك کرایەوە بوو، مناڵێك لەو ماڵە بە گریانەوە هاتە دەرەوە کە دایکی کربوویە دەرەوە و دەرگای لەسەر داخست و چوویەوە ژوورەوە، پاشان مناڵەکە کەمێك ڕۆیشت، پاشان ڕاوەستا، پاشان بیری کردەوە کە هیچ شوێنێکی نییە داڵدەی بدەن و کەس نییە وەك دایکی ئەو بگرێتە خۆ، بۆیە بەدڵێکی شکاوە و چاوێکی پڕ فرمێسکەوە گەڕایەوە لای ماڵەکەی بینی دەرگایان لێ داخستووە، ئەویش بە دڵێکی خەم و پەژارەوە ڕووی خۆی بە قوفلی دەرگاکەوە ناو و خەوی لێ کەوت و نووست، دوای ماوەیەك دایکی دەرگای کردەوە و هەر کە بینی بەو جۆرە لێ نووستوە ئوقرەی نەگرت و بە گریانەوە باوەشی بە کوڕەکەیدا گرت و وتی: بو کوێ چوویت ئەی کوڕەکەم، کێ هەیە داڵدەت بدات جگە لە من! ئەی پێم نەوتی کە سەرپێچیم نەکەیت؟ پێم نەوتی کە ناتوانم سزات بدەم و بە پێچەوانەی فیترەتی خۆم هەڵسوکەوت بکەم کە پڕە لە سۆز و میهرو خۆشەویستی؛ پاشان لەباوەشی گرت و بردیەوە ژوورەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕەحمەتی خودای گەورە زۆر زیاترە لە ڕەحمەتی ئەو دایکە بۆ ئەو کوڕە[1].

---

١ــ سەحیحی موسلیم.







ئەندازەی ڕەحمەتی دایك دەبێت چەند بێت بە بەراورد لەگەڵ رەحمەتی خوا کە هەموو شتێکی گرتووتەوە! خودای گەورە خۆشحاڵ دەبێت کاتێك بەندەیەك کە بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە و ئێمەش بێ بەهر نابین لەو خوایەی کە خۆشحاڵ دەبێت بە گەڕانەوەمان بۆ لای ئەو.

## بەسەرهاتی ئەو کەسەی وشترەکەی ونکردبوو:

خودای بەخشندە بە تەوبە کردن و گەڕانەوەی عەبدی خۆی، لەو کەسە زۆر دڵخۆش و شادتر دەبێت، کە لە بیابانێك بێ و وشترەکەشی خواردن و خواردنەوەی لێ بارکرابێت، جا وشترەکەی بە بارەوە لێی ون بێت و نائومێد بێت لە دۆزینەوەی و بچێتە ژێر سێبەری دارێك پاڵ کەوێت، لەو کاتەدا دەبینێت وشترەکەی بە بارەوە لەبەر دەمی ئامادەبووە، ئەویش یەکسەر ڕێشمەکەی ڕادەکێشێ و لەبەر زۆر دڵخۆشی دەڵێت: "خوایە تۆ عەبدی منی و منیش خوای تۆم". ئەم هەڵەیەش، کە دەیکات لەبەر زۆر دڵخۆشیەکەیەتی[1].

باش بزانە ئەی برای موسڵمان، کە تەوبەی ڕاستەقینە وا لە بەندە دەکات کە زەلیل و بێ دەسەڵات بێت بەرامبەر بە خوا و کروسانەوەی بەندەش دەبێتە مایەی خۆشحاڵبوونی خودای گەورە. بەندەی تەوبەکار ئەوەندەی بۆ خوا شکاوەتەوە و خۆی ئاتاجی ڕەحمەتی خوا زانیوە کە هەر لە چاوەکانیەوە هەستی پێ دەکەیت و لێیەوە دیاردەبێت کە تەوبەی کردوە و بەهۆی ئەو گوناهەی کردوویەتی پەرستشێکی زۆر دەکات بە ڕێژەیەکی وا کە لەوانەیە شەیتان بڵێت: ئەی قوڕبەسەرم بریا ئەو بەندەیەم تۆشی ئەو گوناهە نەدەکرد، هەر لەبەر ئەوە هەندێك لە تەوبەکاران دوای تەوبەکەیان زۆر باشتر و زیاتر پەرستشی خوا دەکەن بەراورد لەگەڵ پێش

١_ سەحیح جامع.







ئەو ماوەیەی کە تەوبەیان کردبوو، بەپێی تەوبەکەیان. هەرگیز خوای گەورە واز لە بەندەکەی ناهێنێت و دەستەمووی ناکات، ئەگەر بەندەکەی بگەڕێتەوە بۆ لای.

ئایا بینیوتە گەر کوڕێك لەگەڵ باوکی بژیت و باوکیشی باشترین خواردن و خواردنەوەی پێ بدات، جوانترین جلی لەبەر بکات، بە جوانترین شێوەش پەروەردەی بکات، (نەفەقە)کەی بە تەواوی پێ بدات، هەر هەموو شتێکی باش کە لەبەرژەوەندی کوڕەکەیدابێت بۆی بەجێ بهێنێت، ڕۆژێك باوکی ئەو کوڕەی بۆ پێویستیەك بنێرێتە شوێنێك، لە ڕێگەدا ڕێگرێك ڕێی لێ بگرێت و بیگرێت و ببەستێتەوە و ببات بۆ سەرزەمینی دوژمن، لەو شوێنە بەپێچەوانەی باوکی ئەو کوڕە ڕەفتاری لەگەڵ بکەن، هەرکاتێك کوڕەکە بیر لە پەروەردەی باوکی و چاکەی بەسەریەوە بکاتەوە سات بە سات ئاخ و حەسەرت دڵی داگیر بکات و ئەو کات هەست بەوە بکات کە پێشتر لە چ ناز و نیعمەت و خۆشیەکدا بووە. ئەو ئێستا لە لای ڕێگرەکانە و بە خراپترین شێوە سزای دەدەن و ئەویش بەرگەی ئەو هەموو ئازار و ناخۆشیانە دەگرێت، تاکوو لە کۆتاییەکەیدا ڕێگرەکان بیانەوێت بیکوژن، کوڕەکە سەیری دێهاتەکە بکات ببینێت کە باوکی وا دیارە و بەرەو ڕووی ئەوان دێت، پاشان هەوڵ بدات تاکوو هاواری خۆی بگەیەنتە باوکی و هاوار بکات: ئەی باوکە، ئەی باوکە، سەیری کوڕەکەت بکە لە چ بارودۆخێکدایە، سەیری فرمێسکەکانم بکە چۆن بەسەر گوناکانمەوە دێنە خوارەوە، لە کاتێکدا کە کراسی باوکی توند گرتبێت و داوای لێ بکات کە ڕزگاری بکات لەدەست ڕێگرەکان، لەهەمان کاتدا ڕێگرەکان بگەنە لای کوڕەکە و لەسەر سەریەوە ڕاوەستن، جا پێت وایە ئەو باوکە مناڵەکەی وا بەجێ دەهێڵێت کە دوژمن هەرچی بیانەوێت لەو کوڕەی بکەن!!؟؟ ئەی گومانت چۆنە بەرامبەر ئەو خوداییەی کە(أرحم الراحمين)ە و لە ڕەحمی دایك و باوك بۆ مناڵەکانی زۆر بەڕەحمترە.







جا قوڵی لێ هەڵماڵە و بە چاوێکی پڕ گریان و دڵێکی ملکەچەوە هانای خۆت بۆ ئەو زاتە پیرۆزە ببە و لێی بپاڕێوە و بڵێ: ئەی خودای بەخشـنده و میهرەبان ڕەحم بە کەسـێك بکە کە ئومێدی بە کەســی تر نییە ڕەحمی پێ بکات تۆ نەبیت، هیچ کەسـێکی تر ناناسـێت کە ســەری بخات تۆ نەبیت، کەســیش نییە کە داڵدەی بدات و چاوی لێ بێت تۆ نەبیت، هەژار و ملکەچی تۆم، پێوستم بە ئاتاجی رەحمەتی تۆیە، تەنها تۆیت کە پەنام دەدەیت و داڵدەم دەدەیت، هیچ ڕزگارکەرێکم لە دۆزەخ نییە مەگەر تۆ نەبیت....

کەوابوو ئەی هاوڕێ...

هەڵمەت بکە بۆ:

کردنی کردەوەی باش......

بەدەستهێنانی پاداشت..........

هاوڕێیەتیکردنی چاکەکاران........

ئاگاداربە لەوەی کە تووشی گومڕایی ببیت دوای ئەوەی خودای گەورە هیدایەتی داوی.

**خودای گەورە لەگەڵتە و پشت و پەنای تۆیە و سەرت دەخات.....**







# سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاس بۆ هەمووو ئەو هاوڕێیانەی کە یارمەتیدەرم بوون لە وەرێگڕانی ئەم بەرهەمە،

بەتایبەتی کاك (میلاد نەجیم) و کاك (بەهزاد چاوشـــــین)، خودای گەورە ئەم کردەوەیە بکاتە توێشووی قیامەتیان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ،لَا إِلَهَ إِلَا أَنْتَ ،أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

و آخر دَعوانا أنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالِمِين

وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ علىَ رَسُول اللهِ وَعلىَ آلِهِ وَصَحبِه أجمَعين.






# ناوەڕۆك





قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾

ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چۆنکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بە بەزەیی یە.

سورة: الزمر

